(٣)

(رۆمان)

# ئاغا و نۆكەر

لیۆن تۆلستۆی

وەرگێڕانی

ئەمین گەردیگلانی



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● ئاغا و نۆکەر

● نووسینی: لیۆن تۆلستۆی

● وەرگێڕانی: ئەمین گەردیگلانی

● نەخشەسازیی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

● پیتچنین: محەمەد ئەمین شاسەنەم

● بەرگ: هۆگر سدیق

● ژمارەی سپاردن: ٦٧٥ لە ٢٠١١ دراوەتێ

● نرخ: ١٠٠٠ دینار

● چاپی یەکەم ٢٠١١

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانەی رۆژهەڵات (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٥٧٥)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## (١)

یەکێک لە ساڵانی دەیەی حەفتا بوو، ڕۆژی دوای جێژنی زستانی، نیکۆلای قەدیسی کڵێسەی گوندەکە ڕێوڕەسمێکی بۆ پیرۆز کردنی ئەو ڕۆژە وەڕێخستبوو. ڤاسیلی ئاندریێڤیچ بێرخوونۆڤ[1] کە بازرگانێکی لە دەستەی دووهەم بوو، نەیدەتوانی گوێ لە بەشداریکردنی ئەو جێژنە بخەوێنێ و دەبوو لەوێ ئامادە بێ. بەتایبەت چونکە بەرپرسی کاروباری ناوەوەی کڵێسە بوو. بەڵام دەبوو لە ماڵەکەی خۆشی میوانداری لە خزمان و دۆستانی بکات. هێشتا میوانەکانی بە تەواوی نەڕۆیشتبوون، خۆی ئامادە کرد کە خێرا بچێت بۆ لای مالیکی گوندەکەی نزیکیان و ئەو دارستانەی لێ بکڕێ کە ماوەیەکی زۆر لە سەر قیمەتەکەی یەک نەدەکەوتن. ڤاسیلی ئاندریێڤیچ دەبوو زۆر بەپەلە خۆی بگەیێنێتە لای مالیکەکە و دەترسا دارفرۆشەکانی شار لە پێش ئەودا بگەنێ و ئەو مامەڵە پڕ قازانجەی لە کیس بچێ. مالیکی لاو بۆ ئەو دارستانە دەهەزار ڕۆبڵی قیمەت دانابوو و نەدەهاتە خوارێ، بەڵام ڤاسیلی ئاندریێڤیچ دەیویست بە حەوت هەزار ڕۆبڵ لێی بکڕێ و لەوە زیاتری پێ نەدەدا. ئەگەرچی دەیزانی ئەو دارستانە زۆر لەوە زیاتر دێنێ. ڤاسیلی ئاندریێڤیچ بەتەما بوو مامەڵەکە بە نرخێکی زۆر لەوە کەمتر ببڕێتەوە، چونکە لێرەوارەکە لە شوێنێک هەڵکەوتبوو کە خۆشی نیشتەجێی ئەوێ بوو، لەمێژ بوو لە نێوان ئەو و دارفرۆشەکانی ئەو ناوچەیەدا بڕیارێک

---

1 Berkhounov

درابوو کە هیچ بازرگانێکی تر مافی ئەوەی نییە لەو ناوچەیەی کە ئەوی لێ نیشتەجێیە مامەڵە بکات و لەگەڵی بکەوێتە ململانێ و بازاڕەکەی لێ بشێوێنێ. بەڵام ڤاسیلی ئاندرێڤیچ ئاگادار کرابوو چەند بازرگانێک دانیشتووی ناوەندی پارێزگا دەیانهەوێ بچن ئەو دارستانەی گۆریاشکینۆ[٢] بکڕن، بڕیاری دابوو هەرچی زووتر خۆی بگەیێنێتە لای مالیکەکە و مامەڵەکەی لەگەڵ یەکلایی بکاتەوە. هەر بۆیە لەگەڵ تەواو بوونی ڕێوڕەسمی جێژن حەوسەد ڕۆبڵی لە سندووقەکەی دەرهێنا، پارەکانی بە وردی بژارد و لە جانتاکەی نا و خۆی ئامادە کرد وەرێبکەوێ.

نیکیتا، کە یەکێک لە خزمەتکارەکانی ڤاسیلی ئاندرێڤیچ و تەنیا کەسێک بوو کە ئەو ڕۆژە سەرخۆش نەبوو، بەپەلە چوو ئەسپەکان لە کاشە ببەستێ. هۆی ئەوەی کە نیکیتای هەمیشە مەست لەو جێژنەدا نەیخواردبۆوە، ئەوە بوو کە ڕۆژی سێشەممەی دانپیانان چاکەت و جزمە قایشەکانی لە سەر ڤۆدکا دانابوو، بۆیە سوێندی خواردبوو کە ئیتر دەم لە ڤۆدکا نادا و ئێستا مانگی دووهەم بوو کە لە سەر سوێندەکەی خۆی سوور بوو، ئەمڕۆش ئەگەرچی بەزم و خواردنەوەی ئەو دوو ڕۆژە جێژنە زۆری وەسوەسە کردبوو، بەڵام هەروا سوور بوو لە سەر سوێندەکەی و تۆبەی نەشکاند.

ئەم نیکیتایە مووژیکێکی پەنجا ساڵان و خەڵکی گوندێکی نزیکیان بوو. دەیانگوت هیچ ماڵ و سامانێکی نییە و زۆربەی تەمەنی دوور لە زێدی خۆی نۆکەری و کرێکاریی کردووە و هەر بەو هۆیەش کە

---

2 Goryatchkino

زەحمەتێکیش و پڕتوانا و بێدەغەڵە و هەروەها ڕووخۆش و دڵپاک و ڕۆحسووک بوو لە دڵی هەمووواندا جێی خۆی کردبۆوە و خۆشیان دەویست. بەڵام لە هیچ جێیەک نەدەمایەوە و ساڵی دوو سێ جار و هێندێ کاتیش زیاتر، بەری لێ بەرەڵڵا دەکرد و دەستی دەکرد بە ڤۆدکا خواردنەوە و جگە لەوەی ئەوەی هەیبوو لەو پێناوەدا دایدەنا، زۆر بە توندیش مەستی دەکرد و کێشەی لەگەڵ دەوروبەرییەکانی هەڵدەگیرساند. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ هەر لە سەر ئەم کارانە چەند جاری دەرکردبوو بەڵام دیسان دوای ماوەیەک دەیگرتەوە، چونکە نیکیتا مرۆڤێکی باش و بەڕەحم بوو، ئاژەڵەکانی خۆش دەویست و لە هەمووشی گرینگتر قانع و چاوتێر بوو. ئەگەرچی هەقدەستی ساڵانەی خزمەتکارێکی وەک نیکیتا هەشتا ڕۆبڵ بوو بەڵام ڤاسیلی ئاندرێڤیچ چل ڕۆبڵی دەدایە، ئەویش قەتی بە سەر یەکەوە پێنەدەدا، بەڵکوو بە چکەچکە دەیدایە و زۆر جاریش پارەی نەغدی پێنەدەدا و کەلوپەلی دووکانی پێدەفرۆشت، ئەویش زۆر بە گرانی بۆ حیساب دەکرد.

مارفا، هاوسەری نیکیتا، کە ژنێکی جوان و بەکار بوو، کوڕێکی مێرمنداڵ و دوو کچەکەی و ماڵەکەی خۆی بەڕێوە دەهێنا و گوێی لەوە نەبوو نیکیتا بێتەوە بۆ ماڵێ و لەگەڵ ئەوان بژی. چونکە نزیکەی بیست ساڵ دەبوو لەگەڵ کابرایەکی بەرمیلبەندی گوندێکی خواروو کەینوبەینی هەبوو، کابراش لە ماڵی ئەوان دەژیا، لە لایەکی تریشەوە ئەگەرچی نیکیتا کاتی وشیاری لە بەردەستی ئەودا وەک مێو نەرم بوو، بەڵام ئەو کاتانەی مەستی دەکرد زۆری لێ دەترسا و نەیدەوێرا زمانی بگەڕێ. جارێکیان کە نیکیتا لە ماڵەوە مەستی کردبوو، جا بۆ

تۆلە کردنەوە و داخی دڵ پێ ڕشتن بوو، کە ژنەکەی ئەوەندەی دەستوور بە سەردا لێدەدا و دەمبەدەمەی لەگەڵ دەکرد و ناچار بوو لە قسەی دەرنەچێ، یان لە بەر هەر هۆیەکی تر، یەغدانی ژنەکەی شکاندبوو و هەموو جلوبەرگ و کەلوپەلەکانی کە دڵی دنیای پێیان خۆش بوو، هەڵیگرتبوو بردبووی لە سەر کۆلکێکی دانابوو و بە تەور هەموویانی ونجڕونجڕ کردبوو. هەقدەستی کارەکەی نیکیتا ژنەکەی وەریدەگرت، نیکیتاش نارەزایەتیی دەرنەدەبڕی. ئەمجارەشیان، دوو ڕۆژ بەر لە جێژن، مارفا چوو بۆ دووکانی ڤاسیلی ئاندریێڤیچ و ئارد و چایی و قەند و نیوە بترییەک ڤۆدکای کڕیبوو کە ئاغا سێ ڕۆبڵی لەسەر مێردەکەی حیساب کردبوو. جگە لەوە پێنج ڕۆبڵ پارەشی بە دەستی لێ وەرگرتبوو، ژنە بۆ ئەو کارەی ڤاسیلی ئاندریێڤیچ و دڵسۆزییە تایبەتییەکەی، سپاسی لێ کردبوو، ئێستاش ئاغا لەبری هەقدەستی مێردەکەی لانیکەم بیست ڕۆبڵیان پێ قەرزدار بوو.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ بە نیکیتای دەگوت: «ئێمە خۆ پێکەوە هیچ حیساب و کیتابێکمان نییە و دەفتەر و سیاییشمان نییە. هەرکات هەرچییەکت پێویست بوو هەڵگیرە، دواتر کار دەکەی و حیسابەکان پاک دەکەی. من وەکوو ئاغاکانی دیکە نیم، هەتا کاتی خۆی پارە و هەقدەستەکەت ڕاگرم، بۆ ئەوەی زەرەد و جەریمەکانت لێ بگێڕمەوە. کاری ئێمە خوداوەکیلییە. تۆ خزمەت بە من دەکەی و منیش ناهێڵم تۆ پەکت بکەوێ.»

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ ئەو قسانەی دەکرد و سادقانە لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دەرهەق بە نیکیتا گەورەیی دەنوێنێ، چونکە بۆ

سەلماندنی قسەکانی خۆی زۆر شارەزا بوو و کرێکار و بەردەستەکانی و لە هەمووشیان زیاتر نیکیتا، ئەوەندەی وتەکانی پشتڕاست دەکردەوە، کە خۆشی تووشی هەڵە بووبوو. هێندێ جار تووشی گومان دەبوو کە ئەوان فریو نادات و بە شێوەیەکی جوامێرانە لەگەڵیان هەڵسوکەوت دەکا!

نیکیتا دەیگوت: «بەڵێ، ڤاسیلی ئاندرێڤیچ، تێدەگەم. من جۆرێک کار دەکەم و بە گیان و دڵ تێوەچووم کە دەڵێی کار بۆ باوکی خۆم دەکەم. من قەدری گەورەیی ئێوەم لە بەرچاوە و ڕێزت لە سەر سەرمە.»

ئەگەرچی زۆر بە باشی دەیزانی کە ڤاسیلی ئاندرێڤیچ فێڵی لێدەکا، بەڵام لە لایەکی دیکەوە دەیزانی کە هەوڵ دان بۆ ڕوون کردنەوەی حیساب و کیتابەکەی بێهوودەیە و وا چاکە هەتا ئاغایێکی باشتر پەیدا دەکا، لەگەڵی بسازێ و ئەوەی پێی دەدەن بەبێ نارەزایەتی قەبووڵی بکا.

ئەمڕۆش کە ئاغا فەرمانی دا کاشەکە ئامادە بکات، نیکیتا وەک هەمیشە گورجوگۆڵ و دەم بەپێکەنین و شاد و بەنەشە ڕۆیشت بۆ هەمارەکە و هەوسار و جیهازی قورس و چەرمی و بە مەنگۆڵە ڕازاوەی ئەسپەکەی لە گوڵمێخەکە کردەوە و لەگەڵ ئەوەی زڕەزڕی زنجیری لەغاوەکە دەهات ڕۆیشت بۆ گەورە دەرگا داخراوەکە کە ئەسپەکەی ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بە تەنیا لەوێ بەسترابۆوە.

لە وەڵامی حیلاندنی نەرمی ئەسپە کوێتەکەدا گوتی: «ها، تاقەتت بەسەر چووە؟ دڵت تەنگ بووە، سەرزل؟» ئەسپێکی شانە بەرزی

کەوی بوو، کەفەڵی تۆزیٚ بە قووڵدا چووبوو و بە تەنیا لە گەورەکەدا بەسترابۆوە. ئەو کاتێک قسەی لەگەڵ ئەسپەکە دەکرد دەتگوت لەگەڵ مرۆڤ قسە دەکات و ئەسپەکەش دەتگوت لە قسەکانی ئەو تێدەگا. «باشە، ڕاوەستە با لە پێشدا ئاوت بدەم.» بە ئاتەگی باڵتەکەی تەپوتۆزی سەر پشت و یاڵی ئەسپەکەی تەکاند، پاشان کڵاوەی چەرمیی لە سەری جوان و پڕنەشەی ئەو ئاژەڵە کەوی و عاملاوە کرد و گوێچکە و یاڵی لە ژێری هێنایە دەریٚ، لەغاوەکەی لە دەمی کردەوە و هەوسارەکەی کێشا و بردیە دەریٚ تاکوو ئاوی بدا. ئەسپە کوێت کاتێک بە هەنگاوی نەرم و هێدی لە سەر گەمرە و پەینی ئەستووری گەورەکە هاتە دەریٚ، کەوتە چەپۆکان و پرمەپرم و لووشکە هاویشتن، دەتگوت لەگەڵ نیکیتا یاری دەکات کە دەیویست بیبات لە سەر بیرەکە ئاوی بدات.

نیکیتا گوتی: «دەتەوێ هاروهاجی بکەی؟ کەوایە چی دەکەی بیکە نارەسەن!» بەڵام دەیزانی ئەسپەکوێت چەندە بەپارێزەوە جیفرک لە خۆی دەدا و لووشکە دەهاویٚ، جۆرێک لەقەی دەخست کە سمی زۆر بە سووکی لە کەڵپۆسەکەی بدریٚ، بەڵام ئازاری پیٚ نەگا و نیکیتا ئەو یارییەی ئەسپەکەی زۆر بەدڵ بوو و کەیفی پێی ساز دەبوو.

ئەسپەکە ئاوی ساردی خواردەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و لێوە تەڕوبرکەی جووڵاند و پرماندی، لەگەڵ پرماندنەکەی تنۆکە ئاوی ڕوون لە مووی لمبۆزی پەڕی و بە سەر ئاخوڕاوەکەدا پرژا، پاشان تۆزیٚ ڕاوەستا، وەک ئەوەی بیر بکاتەوە لەپڕدا زۆر بە توندی پرماندی.

«تێرت خواردەوە؟ ئیتر ناخۆیەوە، باشە مەخۆوە، بەستە. بەڵام دوایی تووشی گێچەڵمان نەکەی!» نیکیتا بە لەبزێکی زۆر جیددی و بە وردی هەموو شتێکی بۆ ئەسپەکە باس دەکرد تاکوو بە جوانی حاڵیی بکا. پاشان هەوساری ئەسپە شۆخ و کورەگوێکەی کێشا کە دەیوست بە هەڵبەز دابەز و لووشکە هاویشتن حەوشەکە بکاتە گۆرەپانی جلیتێن و ڕمبازێن، بە دوای خۆیدا ڕایکێشا و بەپەلە بردییەوە بۆ گەورەکە.

خزمەتکارەکان هیچکام لەوێ نەبوون. تەنیا پیاوێکی غەوارەی لێبوو، ئەویش مێردی ئاشپەزەکەیان بوو کە بە بۆنەی جێژنەوە هاتبوو بۆ سەردانی ژنەکەی.

نیکیتا پێی گوت: «براکەم بچۆ لە ئاغا بپرسە بزانە کام کاشە ئامادە بکەم. گەورەکە یان ئەوی چکۆلەکەیان؟»

مێردی ئاشپەز خۆی کرد بە ماڵێکدا کە باڵەخانەیەکی بەرز بوو و سەربانەکەی بە شیروانی داپۆشرابوو. زۆر زوو گەڕایەوە و خەبەری هێنا کە کاشە چکۆلەکەیان ئامادە بکات و ئەسپەکەی تێبکات. نیکیتا خێرا خامووتەکانی لە ملی ئەسپەکە کرد و زینی چکۆلە و گوڵمێخداری لە پشتی قایم کرد و تەنگە و کەژووی لە بەرزگ و کەفەڵی توند کرد، چەڵەمەی ڕەنگکراوی خامووتەکەی بە دەستێکیەوە گرت و هەوساری ئەسپەکەی بە دەستەکەی تری گرت و ڕۆیشت بۆ لای ئەو ئەمبارەی کە هەردوو کاشەکەی لێبوو. گوتی: «زۆر چاکە، گوتوویانە چکۆلەکەیان ئامادە بکەم، قەیناکا، جیاوازیی نییە، کاشە چکۆلەکەت لێ دەبەستم!» ئەسپە هار و وریاکە بەردەوام وای دەنواند کە دەیهەوێ گازی لێبگرێ و نیکیتا پاڵی

پێوە دەنا و دەیویست بیباتە نێوان دوو قوڵی کاشەکەوە و بە یارمەتیی مێردی ئاشپەزەکە دەستی کرد بە بەستنی خامووتەکان.

کاتێک هەموو شتێک ئامادە بوو و تەنیا بەستنی هەوسارەکەی مابوو، نیکیتا مێردی ئاشپەزەکەی نارد بۆ کادێنەکە تاکوو کا بێنێ و هەروەها ناردی بۆ ئەمبارێکی دیکەش کە پارچە لبادێک بێنێ.

نیکیتا کاتی کار کردن لە بەرخۆیەوە قسەی دەکرد و ئەوەی دەیکرد بە زمانیش دەریدەبڕی، ئەو بە دەم کارکردنەوە گوتی: «زۆر چاکە، ئەوەش ئەوە!» کولۆشە ورد کراوەکەی وا مێردی ئاشپەزەکە هێنابووی لە نێو تەرکی کاشەکەدا بڵاوی کردەوە و لەگەڵ ئەوەی بە پێ دەیشێلا و راستەوپاستەی دەکرد دەیگوت: «دەی تەخت بە دەی. قەڵچغ و لاسقەکانت قیت مەکەوە. ئێستا بەڕەکەت لە سەر ڕادەخەم و بە سەر ئەویشدا لبادەکە، دەوروبەرەکەشت بە کا دادەپۆشم. بەڵێ، ئەمەش ئەوە، ئێستا زۆر جوان دەبێ و بە جوانی لە سەرت ڕادەخرێ.»

پاشان بە مێردی ئاشپەزەکەی گوت: «دەستت خۆش بێ براگیان، ئەگەر پێکەوە نەبوایەین ئاوا بە سانایی کارەکانمان بۆ جێبەجێ نەدەبوو.» قایشی هەوسارەکەی ڕاستەوپاستە کرد و سەرەکەیانی بە ئاڵقەی دەمبێنەکەوە بەست. پاشان لە سەر سەکۆی کاشەکە دانیشت و ئەسپەکەی بەرەو لای دەروازەکە لێخوڕی کە سمی لە پەینی شەختە لێدراوی تەرکی حەوشەکە دەکوتا.

لە پشت سەریەوە دەنگێکی ناسکی منداڵانەی بیست: «خاڵە میکیت[3]، خاڵە، هۆی خاڵە.» کوڕێکی حەوت ساڵان کە کوڵەباڵتەیەکی کەڵپۆسی ڕەشی لە بەردا بوو و جزمەی لبادی سپیی تازەی لە پێدا و کڵاوێکی گەرمیشی لە سەر نابوو، لە ماڵەکە دەرپەڕی و پێی نایە حەوشە و لەگەڵ ئەوەی بە هەڵاتنەوە قۆپچەکانی دادەخست گوتیشی: «منیش سواری کاشە بکە خاڵە گیان!»

نیکیتا گوتی: «باشە هەڵی وەرە، کارئاسکەکەم!» کاشەکەی ڕاگرت، کوڕەی سوار کرد و لە دەرگای حەوشەکە چووە دەرێ. کوڕەی لاواز و زەردەڵی ئاغا لە خۆشیاندا پێی وەعەرزی نەدەکەوت.

کاتژمێر لە دووی دوانیوەڕۆی لادابوو، وڵات بەستەڵەک بوو، هەواکەی دە پلە لە ژێر سیفر بوو و کزەبایەکی وشک هەڵیکردبوو و ئاسمان لێڵ و تەماوی بوو. نیوەی ئاسمان هەورێکی ڕەش دایگرتبوو. هەوای نێو حەوشەکە هێدیتر بوو، بەڵام لە دەرەوە کزەباکەی ڕوومەتی دەرزیئاژن دەکرد. باڕووشک بەفری سەر گوێسوانەی ئەمبارەکانی دەڕنی و لە سووچی دیوار و پەنای حەمامەکەدا گێژی دەدا. لەگەڵ چوونە دەرەوەی نیکیتا لە دەروازەکە و بادانەوەی سەری ئەسپەکە و لە پاڵ پلیکانی چوونە ژوورەوەی کۆشکەکە ڕاوەستانی، ڤاسیلی ئاندرێڤیچ، جگەرە بە لێوەوە و کەڵپۆس لەبەر، کە کەمەرەکەی لە ژێر زگیدا توند بەستبوو، لە داڵانی ماڵەکە هاتە دەرێ و بە جزمەی قایشی مل نمەدییەوە پێی نایە سەر بەفری پەستێوراوی بەر هەیوانە بەرزەکە و سیرەسیرِی جزمە و

---

3 Mikit سووکەڵەناوی نیکیتا

کرپەکرپی بەفر تێکەڵ بوون. لە بەرهەیوانەکە ڕاوەستا. دوایین مژی لە جگەرەکەی دا، قوونچکەکەی فڕێدا و لەگەڵ ئەوەی پێی لێ خشاند دووکەڵی هەڵمژراوی لە کەلێنی سمێڵەکانیەوە دایە دەرێ. پاشان چاوێکی لە ئەسپەکە کرد کە لە دەروازەکە هاتبووە دەرێ و دەستی کرد بە ڕاستەوپاستە کردنی ملیوانەی کەڵپۆسەکەی کە ئەملاو ئەولای ڕوومەتە سوور و تیف‌تیفەدراوەکەی گرتبوو تەنیا مووی سمێڵی پێوە دیار بوو، ملیوانەکەی بە جۆرێک کرد بە نێوەوەدا کە هاڵاوی هەناسەی تەڕی نەکات.

کە چاوی بە کوڕەکەی کەوت لە نێو کاشەکەدایە گوتی: «چاو لەو شەیتانە کە، لەڕێوە خۆی لە دەسک ناوە.» ڤاسیلی ئاندرێڤیچ کە لەگەڵ میوانەکانی زۆری ڤۆدکا خواردبووە، سەرخۆش و بەنەشە دیار بوو، زیاتر لە کاتی ئاسایی دڵخۆش دیار بوو، چونکە بیری لە سامانی خۆی دەکردەوە و لە خۆشیی ئەو مامەڵانەی گەزگەز بالای دەکرد. دیتنی کوڕەکەشی کە ئەو هەمیشە لە دڵی خۆیدا بە وەلیعەهدی خۆی دەزانی، ئەوەندی‌تر دڵی ئاوپڕژێن کرد و نەشەی پێ بەخشی. بە پێلووی تێک‌بەزیو و بسکەی سمێڵەوە بە جۆرێک کە ددانە درێژەکانی وەدیار کەوتبوون تێی ڕامابوو.

ژنە کز و قەد باریکەکەی ڤاسیلی ئاندرێڤیچ کە دووگیان بوو و لەچکە پەشمینەکەی توند لە سەر و ملی پێچابوو، تەنیا چاوی بە دەرەوە بوو، هاتبوو بۆ بەڕێ‌کردنی مێردەکەی و لە نێو دەرگانەکەدا لە پشت سەری ئەو ڕاوەستابوو.

هەنگاوێکی هەڵێنایەوە و شەرمنانە گوتی: «بڕوانە دەڵێم چی، وا چاکە نیکیتا لەگەڵ خۆت بەری! بەڕاستیمە، بیبە لەگەڵ خۆت.»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ وەڵامی نەدایەوە. دیار بوو قسەی ژنەکەی بە دڵ نییە، چونکە نێوچاوانی گرژ کرد و بە تووڕەیی تفی کردەوە.

ژنە هەر بەو لەبزە سکالائامێزەوە گوتیشی: «پارەت لەگەڵ خۆت بردووە! لەوانەیە هەواکەی ناخۆشتر بێ، پیاوەکە بەڕاستیمە، تۆخودا بە قسەم بکە! خودا خێرت وەڕێبێنێ.!»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ هەر ئەو جۆرەی کە عادەتی بوو لەگەڵ مشتەرییەکانی، کڕیار و فرۆشیار، قسە بکا، بایەکی لە گوویی کرد و لەگەڵ ئەوەی لێوی لەراندەوە و وشەکانی بە شێوەیەکی دانار دانار دەردەبڕی، گوتی: «تۆش قسەی وا دەکەی! مەگین من منداڵم یان شارەزای ڕێگا نیم کە هاوڕێ لەگەڵ خۆم بەرم؟»

ژنە لەچکەکەی لە سەری توندتر کرد و دیسان گوتی: «باشە، دەزانم، بەڵام وا باشە لەگەڵ خۆت بیبەی. تۆخودا، لەبەر دڵی من بیبە لەگەڵ خۆت.»

ـ پەککوو، ئەمەش وەک قڕنوو بە پیاوەوە دەنووسێ و بەری نادا. ئاخەر بیبەم بۆ کوێ؟

نیکیتا بە پێکەنینەوە گوتی: «ڤاسیلی ئاندرێڤیچ، ئەگەر تۆ بتەوێ من قسەیەکم نییە و دێم لە خزمەتتدا.» ڕووی لە ژنی ئاغاکەشی کرد و گوتی: «بەڵام کاتێک من لە ماڵێ نیم دەبێ کەسێک ئالیک بۆ ئەسپەکان تێکا.»

ژنی ئاغا گوتی: «من ئاگام لێیان دەبێ نیکیتووشکا. بە سیمۆن دەڵێم بۆیان تێکا.»

نیکیتا چاوەڕێی ڕەزایەتی ئاغاکەی بوو. ڤاسیلی ئاندریێڤیچ گوتی: «دەی باشە، چبکەم. وا دیارە ناکرێ قسە لە قسەی خاتوونی گەورەدا بکرێ!» بە بزەیەکی تەشەراوییەوە و چاوقرتاندنێک ئاماژەی بە کەڵپۆسەکەی نیکیتا کرد کە هەموو پیس و چەورو چلیک بوو، پشت و بنباخەڵەکەی دڕاو و داوێنەکەی ڕیشاڵ ڕیشاڵ، دیار بوو زۆر کۆنە و کەڵکی لێبڕاوە و دەستی ڕۆژگار پەکی بە ئەویش خستووە، گوتی: «باشە، ئەگەر دەتەوێ بێی بڕۆ شتێکی گەرمتر لە بەرکە.»

نیکیتا دەنگی هەڵێنا و بە مێردی ئاشپەزەکەی گوت کە هێشتا لە حەوشە بوو: «ودرە براکەم ئاگات لەو ئەسپە بێ!»

کوڕی ئاغا قیژاندی و دەستی لە سەرمانا کەسیرەبووی لە گیرفانی دەرهێنا و هەوساری سارد و سەهۆڵاویی ئەسپەکەی گرت و گوتی: «من لێزەم. خۆم دەیگرم!»

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ بە بزەیەکی مانادارەوە بە نیکیتای گوت: «بەڵام زۆر خۆت مەگنخێنە، زوو کە، کاتمان نییە و درەنگە.»

نیکیتا گوتی: «هەرئێستا باوکەگیان، ڤاسیلی ئاندریێڤیچ!» بە لاقی خوار و پەیزەن و جزمەی کۆن و لبادییەوە بە هەڵەداوان خۆی کرد بە حەوشەکەدا و چوو بۆ ژووری خزمەتکاران.

چووە نێو ژوورەکە و گوتی: «ئارینووشکا[4]، زووکە. باڵتەکەم بدەیە لە پشت کوورەکەیە. دەبێ لەگەڵ ئاغا بڕۆم.» خۆشی کەمەربەندەکەی لێکردەوە کە بە بزمارێکدا هەڵواسرابوو.

---

4 Arinuchka

ئاشپەزەکە دوای فراوێن سەرخەوێکی شکاندبوو، شاد و بەنەشە سەماوەری بۆ مێردەکەی تێخستبوو. بە ڕوویەکی خۆشەوە بە دەنگ نیکیتاوە هات و پەلە و هەلەی نیکیتووشکا ئەویشی گرتبوو، کەوتە خۆ و باڵتە کۆنەکەی کە لە پشت کوورەکە هەڵیواسیبوو وشک بێتەوە، لە سنگەکەی کردەوە، هەڵیتەکاند و دوو جار دەستی پێدا هێنا و دایە دەستی.

نیکیتا بە ژنەکەی ئاشپەزی گوت: «ئێتر تۆ و مێردەکەت سەرتان فارغ دەبێ و دەرفەتتان هەیە بە کەیفی خۆتان ڕایدەن.» پیاوێکی دڵپاک و ڕووخۆش بوو و هەوڵی دەدا قەت توورە و ڕووناخۆش نەبێ، بۆیە زۆر خاکەڕایانە و خۆمانە لەگەڵ هەموو کەس گاڵتەوگەپی دەکرد و پێدەکەنی.

کەمەربەندە باریک و بادراو و ڕەنگبواردووەکەی لە پشتی بەست و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، ئەوەندەی توانیی زگی برد بە ناوەوەدا و ئاغزوونەکەی لە سەر جلەکانییەوە داخست.

ئەو کاتەی کەمەربەندەکەی لە قەدی توند کرد و خەریک بوو ڕاستەوپاستەی دەکرد، ئێتر نەک بە ژنە ئاشپەزەکە بەڵکوو بە کەمەربەندەکەی گوت: «زۆر چاکە، ئێستا ئێتر ناکرێیتەوە!» چەند جار شانوپیلی هەڵتەکاند تا قۆڵوباڵی ئازاد بێ و بتوانێ بە جوانی هەڵسووڕێ. پاشان ئەو باڵتەیەی ئاشپەز پێیدابوو بە سەر کەڵپۆسەکەدا لە بەری کرد و پشتی دانەواند تاکوو جوانتر بە بەریدا بچێ. دوای ئەویش دەستێکی بە ژێر باخەڵی خۆیدا هێنا و چوو دەستکێشە یەکپەنجەییەکەی لە سەر ڕەفحەکە هەڵگرت و گوتی: «زۆر چاکە، ئێستا هەموو شتێک جێبەجێ بووە.»

ئاشپەزەکە گوتی: «ستێپانیچ، بریا بەلەکپێچە لمەدییەکانیشت لە لاقت کردایە. چونکە جزمەکانت زۆر شەقوشڕن.»

نیکیتا، وەک ئەوەی تازە وەبیری هاتبێتەوە، تۆزێ ڕاوەستا و چاوی لە لاقوقولی خۆی کرد. پاشان گوتی: «ئەرێ وا باشتر بوو، بەڵام هەر ئاواش خراپ نییە. ڕێگاکەمان نزیکە.» ئەوەی گوت و بە هەڵەداوان ڕۆیشتە دەرێ.

کاتێک گەیشتە لای کاشەکە، ژنی ئاغا گوتی: «سەرمات نییە نیکیتووشکا؟»

نیکیتا کای تەرکی کاشەکەی ڕێکوپێک کرد و بەرەو لای پێشەوە ڕایدا تاکوو لاقی ئاغاکەی داپۆشێ و قامچییەکەی کە بۆ ئەو ئەسپە کەوییە پێویست نەبوو کردی بە ژێر کایەکەدا و گوتی: «نا، بۆ دەبێ سەرمام بێ؟ زۆریشم گەرمایە!»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ کە لە نێو کاشەکەدا دانیشتبوو و پشتە پانەکەی لە نێو دوو باڵتەی بەرتیسکندا نێو کاشەکەی پڕ کردبوو، قایشی هەوسارەکەی بە دەستەوە گرت و لە پشتی ئەسپەکەی دا تاکوو وەڕێ بکەوێ. کاشەکە وەڕێکەوتبوو کە نیکیتا بە هەڵەداوان پێی گەیشتەوە و لە لای پشتەوەی کاشەکە و بەری دەستەچەپ دانیشت و لاقێکی بە لێوارەکەیدا شۆڕ کردەوە.

## (٢)

ئەسپی هێدی و کەوی کاشەکەی بە گورجی و چالاکی بە سەر ڕێگای بەستەڵەک و تەکووزی گوندەکەدا ڕادەکێشا و سیرە و خشەی پێچکەی خێشکی کاشەکە و تەقوکوتی سمی ئەسپە کوێت دەنگی دەدایەوە.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ کە دیار بوو زۆری حەز لە هاروهاجی و جووڵەجوولی وەلیعەهدەکەیەتی کە لە دوای کاشەکەوە سوار بووە، گوتی: «دابەزە سەگباب، نیکیتا دا ئەو قامچییەت بدە بە من!»

کورە بازی دا خواری و ئەسپەکە خێراییەکەی زیاد کرد و کەوتە لۆقە کردن.

کریستی٥ گوندێکی چکۆلە بوو کە ڤاسیلی ئاندریێڤیچ لەوێ نیشتەجێ بوو، ئەو گوندە شەش ماڵی زیاتر لێ نەبوو. کاتێک لە بەر دوایین ماڵەوە تێپەڕین کە ماڵی ئاسنگەرێک بوو و لە دێ وەدەر کەوتن، بۆیان دەرکەوت کە هەواکەی زۆر لەوە ناخۆشتر و تووشترە کە بیریان لێ کردبۆوە. بەفر لەڕێوە شوێنی خێشکەکەی پڕ دەکردەوە و ڕێگاکە تەنیا بەو نیشانەیەدا دیار بوو کە لە زەوییەکانی دەوروبەری بەرزتر بوو. لەو دەشتەدا کڕێوە گێژی دەدا و سنووری نێوان عەرز و ئاسمان دیار نەبوو. لێرەواری تلیاتین٦ کە هەمیشە بە باشی دەکەوتە بەرچاو، تەنیا جاروبار لە پشت پەردەی بەفرەکەوە وەک تاپۆیەکی ڕەش خۆی دەنواند. زریانی دەهات و منجرانە یاڵی ئەسپەکەی لە سەر ملی قیتی بە لایەکدا دەخست و کلکی

---

5 Kresti
6 Telyatin

دەئالۆزاند کە ڕێک و خشت قوڵە کرابۆوە و جاری وا بوو بۆ لایەک خواری دەکردەوە. ملیوانەی درێژی باڵتەکەی نیکیتا، کە بایەکە هەڵیدابۆوە، بە ڕوومەت و لووتیەوە نووسابوو.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ چاوی لە ئەسپەکەی دەکرد و وەکوو لاواندنەوە گوتی: «بەو هەوا تووشە ئەم بەستەزمانەش ناتوانێ ئەو جۆرەی پێویستە ڕێگا ببڕێ. بەفرەکەی زۆرە. جارێکیان بە نیو سەعات منی گەیاندە پۆشووتین۷.»

نیکیتا کە ملیوانەکەی بەر گوێچکەی گرتبوو بە جوانی گوێی لە قسەی ئاغاکەی نەبوو، لێی پرسی: «چیت گوت؟»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ دەنگی هەڵبڕی: «دەڵێم بە نیو سەعات گەیشتمە پۆشووتین.»

نیکیتا گوتی: «بەڵێ وایە، هێندە ئەسپێکی خۆشبەزە قسەی لە سەر نییە.»

ماوەیەک بێدەنگ بوون. بەڵام ڤاسیلی ئاندرێڤیچ حەزی لە قسە کردن بوو. هەر بەو دەنگە بەرزە گوتی: «حەتمەن بە ژنەکەت گوتووە، ڤۆدکا دەرخواردی ئەو بەرمیلبەندە نەدا و ئەوەندەی نەلەوەڕێنێ، ها؟»

هێندە لە خۆی دڵنیا بوو و خۆی بە کەسایەتییەکی خاوەن کەماڵ و بەرجەستە دەزانی، پێی وا بوو نیکیتا کەیفی بەو گاڵتەیە ساز دەبێ و لە خوداشی دەوێ ئاغاکەی قسەیەکی وای لەگەڵ بکا، بۆیە زۆری ئەو گاڵتەیەی خۆی بە دڵ بوو و بە خەیاڵیشیدا نەهات کە لەوانەیە نیکیتا بە دڵیەوە بگرێ.

---

7 Pochutin

گفـە و هـاژەی بـا دیـسان نـەیهێـشتبوو نیکیتـا گـوێی لـە قـسەی ئاغاکەی بێ.

ڤاسیلی ئاندرێ‌ڤیچ بە دەنگی بەرز و وشـەی دانـە دانـە زۆر بـە ڕوونی گاڵتەکەی دووپات کردەوە.

نیکیتا گوتی: «من دەیاندەمـە دەسـت خـودا، ڤاسـیلی ئانـدرێ‌ڤیچ. چ کارم پێیان داوە؟ هەر منداڵەکان ئازار نەدا، ئیتر هـەرچی پێـی خۆشـە با بیکا. خۆی و خودای خۆی!»

ڤاسیلی ئانـدرێ‌ڤیچ گـوتی: «هـەروایـە!» پاشـان باسـێکی دیکـەی هێنایە گۆڕێ و پرسیی: «ئێستا پێم بڵێ بزانم، بـۆ بـەهـاری خـەیاڵـت نییە ئەسپێک بکڕی؟»

نیکیتـا قوپچـەی مێلوانـەکـەی کـردەوە و ئـاوڕی بـۆ لای ئاغاکـەی دایـەوە و لـە وەڵامـدا گـوتی: «بـا، دەبـێ بکـڕم ڤاسـیلی ئانـدرێ‌ڤیچ، چارەیەکی ترم نییە!»

ئەو قسانە بۆ نیکیتا زۆر سەرنج‌ڕاکێش بوو و دەیویست بە باشـی گوێی لە هەموو شتێک بێ. گوتی: «کوڕەکەم خەریکە گەورە دەبێ، ئیتر دەبێ خۆی جووت بکا. تا ئێستا کرێکارمان بەکرێ دەگرت.»

ڤاسیلی ئاندرێ‌ڤیچ دەنگی هەڵێنا: «زۆر چاکە، بۆ ئەسپە ڕەقەڵ لـە من نـاکڕی؟ مـەترسـە بـە گرانـت پـێ نـادەم!» کـەیفی سـاز بـوو، بۆیـە هەوای فرۆشتنی ئەسپ لـە سـەری دابـوو، کـڕین و فرۆشـتنی ئـەسـپ کارێک بوو کە هۆش و ئیختیاری لە لا نەدەهێشت.

نیکیتـا گـوتی: «خـودا لـە گـەورەییتـان کـەم نـەکـا! بـەڵام ئـەگـەر گـەورەیـی بنـوێنی و پـازدە ڕۆبڵـم پـێبـدەی، دەچـم لـە بـازاڕی ئـاژەڵ

ئەسپێک دەکڕم. بۆ من بە قازانجترە.» ئەو دەیزانی ئەو ئەسپەی ڤاسیلی ئاندرێڤیچ باسی دەکا، حەوت ڕۆبڵیش ناهێنێ، ئاغاکەشی حەتمەن بە بیست و حەوت ڕۆبڵ لە ملی قایم دەکا و ئیتر هەتا شەش مانگی تر چاوی بە پارە ناکەوێ.

دەنگی هەڵبڕی: «ئەو ئەسپەی من دەتدەمێ وەک گوێزی ئازا وایە. تۆ خۆمانەی، پێم حەیفە بۆ تۆ نەبێ. من قازانجی تۆم لە بەرچاوە. وەک بۆ خۆمی بکڕم وایە. بێرخوونۆڤ ڕازی بە زیانی هیچ کەس نییە. بە شەرەفم حەز دەکەم خۆم زەرەد بکەم، بەڵام تۆ زەرەد نەکەی. خۆ من وەک ئاغاکانی دیکە نیم.»

ئەو قسەکانی بە لەبزێک دەردەبڕی کە بۆ ڕازی کردنی مشتەرییەکانی کڕیار و فرۆشیار کەڵکی لێ وەردەگرت: «زۆر ئەسپی چاکە، قسەی لە سەر نییە.»

نیکیتا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «هەرچی ئێوە بفەرموون!»
کە دیتی ئاغاکەی ئیتر قسەی نەماوە، قۆپچەکەی داخستەوە و بە ملیوانەی باڵتەکەی گوێچکە و دەموچاوی داپۆشی.
نزیکەی نیو سەعات ڕێیان بڕی و هیچیان نەگوت. کەڵپۆسەکەی نیکیتا دڕابوو و کزەی سەرما قۆڵ و لاقەبرغەی تەزاندبوو. خۆی کۆم کردبۆوە و ملیوانەکەی بە بەردەمیەوە گرتبوو و دەیویست بە هالاوی دەمی، خۆی گەرم دابێنێ، زۆر بە ناچاری و خۆڕاگرییەوە ئەو سەرمایەی تامڵ دەکرد.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ گوتی: «تۆ وای بە باش دەزانی لە کارامیشیڤۆوە٨ بڕۆین یان ڕاست بڕۆین؟»

ئەو ڕێگایەی بە کارامیشیڤۆدا تێدەپەڕی هاتوچۆی زۆر بە سەرەوە بوو و هەردوو بەری ڕێگاکە بۆ نیشانە کردنی ڕەوگەکە کێلەداری لێ چەقابوو، بەڵام دوورتر بوو. ڕێگا ڕاستەوخۆکە نزیکتر بوو بەڵام کەمی هاتوچۆ بە سەرەوە بوو و ڕەوگەکەشی بەفر داپۆشیبوو و بە باشی نەدەبیندرا.

نیکیتا تۆزێ بیری کردەوە و پاشان گوتی: «ڕێگای کارامیشیڤۆ دوورترە، بەڵام خاترجەمترە.»

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ کە دەیویست ڕێگا ڕاستەوخۆکە هەڵبژێرێ و زووتر بگاتە جێ، گوتی: «ئەگەر ڕاست بڕۆین دوای تێپەڕین لە خەرەندە سێلاوگرەکە مەترسیی ڕێگا لێشێوان نامێنێ و دوای ئەویش لێرەوارەکەیە.»

نیکیتا گوتی: «هەرچۆنێک حەزت لێیە با وابێ!» پاشان دەستی لە ملیوانەکەی بەردا.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ ئەو ڕێگایەی دەیویست هەڵیبژارد و دوای بڕینی نیو وێرست لە ڕێگاکە، گەیشتنە شوێنێک کە لقوپۆپی بەرزی دار بەڕوویەک بە هێندێ گەڵای ویشکەوە کزەی با ڕایدەوەشاند، لەوێوە بە لای چەپدا بایاندایەوە.

لە دوای ئەو بادانەوەیە بەرەوڕووی کزەبا دەڕۆیشتن و کرێوە گێژی دەدا و دەبوو بە باڕووشک و لە سەروچاویان دەدرا. ڤاسیلی

8 Karamychevo

ئاندریڤیچ کاشەکەی لیدەخوڕی و لەگەڵ هەناسەکێشانی قووڵ گووپی هەڵدەماساند و بە کەلێنی سمێڵەکانیدا هەناسەی دەردەدایەوە. نیکیتا پێلووی قورس بووبوو و وەنەوزی دەدا.

بێئەوەی لەگەڵ یەکتری بدوێن دە خولەک ڕێگایان بڕی. لە ناکاو ڤاسیلی ئاندریڤیچ شتێکی گوت. نیکیتا چاوی هەڵێنا و گوتی: «چی؟»

ڤاسیلی ئاندریڤیچ وەڵامی نەدایەوە، خۆی دادەنەواند و چاوی لە دواوە و لە پێشەوە دەکرد.

ئەسپەکە لە بەر ماندوویی ئارەقەکەی کردبوو و مووی لاران و لاملی تەڕ و لووول بووبوو. دیار بوو زۆر گوشار بۆ خۆی دێنێ ڕێگا ببڕێ و بە نەرمی هەنگاوی هەڵدێنایەوە.

نیکیتا دووپاتی کردەوە: «ئاغا ئەرێ چیت گوت؟»

ڤاسیلی ئاندریڤیچ کە ڕقی هەستابوو لاسایی نیکیتای کردەوە: «چیت گوت، چیت گوت! خۆ کێلەداری گوێ ڕێگا لە هیچ کوێ دیار نییە. پێموا ڕێگاکەمان لێ تێکچووە!»

نیکیتا گوتی: «باشە، کەوایە ڕایگرە با ڕێگاکە بدۆزینەوە.» زۆر سووک و گورج بازیدا خوارێ و قامچییەکەی لە ژێر کایەکە دەرکێشا، بەڵام شوێنەواری ڕێگاکە لە هیچ کوێ دیار نەبوو.

ڤاسیلی ئاندریڤیچ کاتێک نیکیتا بۆ لای کاشەکە گەڕایەوە لێی پرسی:

- دەی چیت کرد؟

- لەم لایەوە وێناچێ ڕێگا بێ، دەبێ بچین بۆ ئەو لایە و بۆی بگەڕێین.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ گوتی: «هۆو پێشەوە چاو لێکە، ئەوە چییە ڕەش دەکاتەوە؟ بچۆ چاوی لێکە بزانە چییە؟»

نیکیتا چوو بۆ ئەو شوێنەی ئاغاکەی پێی گوت، چاوی لە ڕەشانگەکە کرد. ڕەشانگەکە پرزە و لاسکی وشکەڵی جێگا وێنجەیەکی ڕووتەن بوو گژەبا هێنابووی لە کەویلکە بەفرەکەی پرژاندبوو و ڕەشی داگیرابوو. نیکیتا تۆزێ بۆ لای ڕاست ڕۆیشت، بەڵام دیسان بە پەلە گەڕایەوە بۆ لای کاشەکە، لاقی لە عەرزی کوتا و بەفرەکەی لە خۆی تەکاند تاکوو چەکمەکانی لەو بارە سپییەیان سووک بکات و چوو لە نێو کاشەکەدا دانیشت.

بە لەبزێکی لێبڕاوانە گوتی: «دەبێ بڕۆین بۆ لای ڕاست. بەر لەوەی بادەینەوە کزەباکە لە لاقەبرغەی چەپەمی دەدا، بەڵام ئێستا لە پێشەوە لە دەموفلچمی دەدا.» وەک ئەوەی فەرمان بدا گوتی: «بەرەو لای ڕاست لێخوڕە.»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بە قسەی کرد و سەری ئەسپەکەی بۆ لای ڕاست گێڕا. بەڵام دیسان شوێنەواری ڕێگاکە دیار نەبوو.

ماوەیەک هەروا چوونە پێشێ. بایەکەی نەدەخست و هەروا کرێوە گێژی دەدا.

نیکیتا لە ناکاو، بە لەبزێک کە دڵساردیی پێوە دیار بوو گوتی: «ڤاسیلی ئاندرێڤیچ، وا دیارە ڕێگامان لێ شێواوە.» چەند کۆما گەڵای پەتاتەی پیشان دا کە لە نێو بەفرەکەدا ڕەشیان دەکردەوە و پرسیی: «بڕوانە، ئەوانە چین؟»

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ ئەسپە شەکەتەکەی ڕاگرت کە تەواوی گیانی لە ئارەقەدا خووسابوو و هەردوو لاکەلاکەی بە توندی هەڵدەستان و دەنیشتنەوە. پرسیی: «مەگین چییە؟»

ـ دەتەوێ چی بێ؟ ئێمە ئێستا لە نێو مەزراکەی زاخارۆڤین. بڕوانە بۆ کوێت هێناوین!»

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ وەڵامی دایەوە: «قسەی هەڵیتوپڵیت مەکە!»

نیکیتا گوتی: «نا، من قسەی هەڵیتوپڵیت ناکەم، ڤاسیلی ئاندریێڤیچ. بەڕاستمە. بە خشەی کاشەکەدا دیارە ئێمە بە نێو دێراوی پەتاتەدا دەڕۆین. ئەوەش کۆمای لاسق و گەلای پەتاتەیە. ئێرە مەزرای پەتاتەکەی زاخارۆفە.»

«وەڵڵا جوانە! ڕێگا لە کوێوەیە و ئێمە لە کوێین! ئێستا چی بکەین؟»

نیکیتا گوتی: «هیچ، دەبێ ڕاست بڕۆین. ئاخری دەگەینە جێگایەک. یان دەگەینە زاخارۆکا، یان دەچینە دیوەخانەکەی ئاغا زاخارۆف.»

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ بە قسەی کرد و ئەسپەکەی بەو لایەدا لێخوڕی کە نیکیتا گوتی. ئەوان ماوەیەکی زۆر ڕۆیشتن. هێندێ جار بە زەویی ڕەشانگدا دەڕۆیشتن و خێشکی کاشەکە بە سەر خاک و گڵمتکی بەستوودا دەخزین و هێندێ جاریش بە جاڕەگەنمی پڕ کڵۆش و سرووتدا، کە لاسقی تیژ و قرتاوی گەنم سەریان لە بەفرەکە دەرهێنابوو. لە زۆر جێش لقەگیا و داوەڵ چەقیبوون و بە دەم کزەباوە دەجووڵانەوە، یان بە شێوەردی پایزەکێڵ و بەهارەکێڵدا تێدەپەڕین. زۆر جاریش دەکەوتنە سەر کەویلکە بەفری ئەستوور و

پەستێوراو کە بەفربەسەرێکی لووس و سامالسا بوو و هیچ پەڵە و ڕەشانگێک لە سەر سینگیی سپیی وەبەرچاو نەدەکەوت.

کڕێوەی دەکرد و هێندێ جار بە دەم باوە گێژی دەدا و دەبوو بە باپووسکە. دیار بوو ئەسپەکە زۆر شەکەتە و مووی لەشی تەواوی لەبەر خووساوی لوول بووبوو. یاڵ و سەرپشت و لازگی ئارەقەکەی بەستبووی و دەتگوت سیخواری لێنیشتووە. زۆری گوشار بۆ خۆی دێنا و بە کاوەخۆ دەڕۆیشت. لە ناکاو لاقی خزی و کەوتە قووڵکێکەوە هەتا ڕانی چووە خوارێ. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ دەیویست لە جێی خۆی نەجووڵێ. بەڵام نیکیتا گوڕاندی بە سەریدا: «بۆ دانیشتووی لە جێی خۆت نابزووی؟ تووشی گێچەڵ بووین. دەبێ دەریهێنینەوە.»

ئەگەرچی دەیگوڕاند بەڵام دەنگی نەشەی پێوە دیار بوو. بازیدا خوارێ لە سەر کاشەکە و لاقی لە بەفرەکە چەقی.

ئەسپەکە وزاقێکی لە خۆی دا و بە تەکانێک لە قووڵکەکە هاتە دەرێ. دیار بوو کەوتۆتە نێو خەندەکێکەوە.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ گوتی: «بڵێی ئێستا ئێمە لە کوێ بین؟»

نیکیتا وەڵامی دایەوە: «پەلە مەکە، مەعلووم دەبێ. با بڕۆین. ئاخری دەگەینە جێگایەک.»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ پەڵەیەکی ڕەشی لە پێش خۆیانەوە نیشان دا کە لە دوورەوە لە نێو بەفرەکەدا دیار بوو، گوتی: «وا دیارە ئەوە لێرەوارەکەی گۆریاشکینۆیە. وا نییە؟»

نیکیتا گوتی: «ئێستا دەچین بزانین کام لێرەوارە.»

نیکیتا دەیدی کە لە لای ئەو پەڵە ڕەشەوە کە لە پێشیانەوە دیار بوو، گەڵای درێژۆکەی وشک با لوولیان دەدا بۆ لای ئەوانی دێنێ، بۆیە بەو ئاکامە گەیشت کە ئەو پەڵەیە دارستان نییە بەڵکوو دەبێ گوندێک بێ. بەڵام نەیدەویست قسە بکات و بەڕاستی هێشتا بیست، بیست و پێنج مەتر لە خەندەکەکە دوور نەکەوتبوونەوە کە تاپۆی دارەکان بە ڕوونی لە بەرچاویان وەدیار کەوت. ناڵەیەک دەهاتە گوێ کە بە لایەوە تازە بوو. نیکیتا باشی بۆ چووبوو. تاپۆکە دارستان نەبوو، بەڵکوو ڕیزە داربییەک بوو کە هێشتا جێ‌جێ گەڵایان پێوەمابوو و بە دەم باوە دەلەرینەوە. ئەم دارە بییانە دیار بوو تەیمانی دەوری ئەو خەندەکەن کە لە دەوری جێ‌خەرمانەکە چەقاندبوویان. کە گەیشتنە لای بییەکان و لە نزیکەوە بیستیان گڤەی با خۆی دەکرد بە نێو لکوپۆپە وشکەکانیاندا و ناڵەیەکی خەماوی لە پەلی سەرمابردوویان هەڵدەستا، ئەسپەکە لە ناکاو کەوتە سەر پاشوو و هەردوو دەستی بەرز کردەوە و پاشان هەردوو لاقیشی لە سەر بەرزاییەکە دانا و بۆ لای چەپ سووڕا. ئەمجارەیان هەتا چۆکی لە بەفرەکە چەقیبوو. دیار بوو کەیشتوونەتە سەر ڕێگا.

نیکیتا گوتی: «دەی ئەوە گەیشتین. بەڵام نازانین کوێیە!»

ئەسپەکە ڕاست و بە دڵنیایی بە سەر جادەی بەفرگرتوودا دەڕۆیشت و حەفتا و هەشت مەتر زیاتر نەڕۆیشتن کە تاپۆی دیوارێک لە پێشیانەوە وەدیار کەوت. دیار بوو دیواری ئەمبارێکە و بەفرێکی قورس سەربانەکەی داپۆشیبوو. بە لای ئەمبارەکەدا تێپەڕین. جادەکە بەرەوڕووی کزەبا و باڕووشک بایدەدایەوە و ئەوان لە نێو

کۆما بەفرێکی زۆردا گیریان خوارد. بەڵام کۆلانێکی تەنگ لە نێوان دوو ماڵدا وەدیار کەوت. دیار بوو ئەو کۆما بەفرە بارِن هێناویەتی و لە زارکی کۆلانەکەی پەستاوتووە. دەبوو بە نێو ئەو بەفرەدا تێپەڕن و هەر بەڕاستیش کە لە بارِندەکە تێپەڕین چوونە نێو کۆلانەکەوە. لە ماڵەکەی ئاخریان جلوبەرگ بە تەنافدا هەڵواسرابوون، بووبوونە یەک پارچە سەهۆڵ، وەک مەشکە ڕەق بووبوون و بە دەم باوە ڕادەوەشان. دوو کراس بوون، یەکیان سوور و ئەوی‌تریان سپی، پانتۆڵێک و جووتێ سۆرانی و تەنوورەیەک. کراسە سپییەکە لە هەموویان زیاتر ڕادەوەشا و دەتگوت دەیهەوێ خۆی لە تەنافەکە بکاتەوە و بە توندی هەردوو قۆڵەکەی لە یەک دەدا.

نیکیتا چاوێکی لە کراسە شەکاوەکان کرد و گوتی: «بڕوانە، ژنی چەندە لەشگرانیش هەیە، یان ڕەنگە مردبێ. جلە شۆراوەکانی بۆ ڕۆژی جێژنیش لە تەنافەکە نەکردۆتەوە.»

(٣)

لە کۆڵانی گوندەکەدا بایەکەی زۆر توند بوو و بەفر ڕێگاکەی گرتبوو، بەڵام کە گەیشتنە نێوەڕاستی کۆڵانەکە، بایەکەی خست و لەو شوێنە پەنابایە هەواکەی گەرمتر و نەشەبزوێنتر بوو. لە حەوشەیەکدا سەگێک دەوەڕی و لە حەوشەیەکی دیکەش، ژنێک چاکەتەکەی دابوو بە سەریدا لە لایەکەوە بە هەڵاتن بەرەو ماڵێ ڕۆیشت و لە بەردەرگانەکە تۆزێ ڕاوەستا کە سەیری تازە هاتووان بکات. لە لایەکی گوندەکەشەوە دەنگی گۆرانیی کچانی گوندنشین دەهات.

وێدەچوو لە نێودێ بەفر و با و سەرما هێدی‌تر بێ لە سەحرا.

ڤاسیلی ئاندرێ‌ڤیچ گوتی: «ئێرە خۆ مۆلچانۆڤکا[9]یە.»

نیکیتا گوتی: «ئەرێ، وایە.»

هەر بەڕاستی گوندی مۆلچانۆڤکا بوو. دیار بوو زۆر بە لای چەپدا ڕۆیشتوون و بە هەڵە نزیکەی هەشت وێرست ڕێگایان بڕیوە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەڵە و سەرلێ‌شێواییەش ئاخری لە شوێنی مەبەست نزیکتر بووبوونەوە، چونکە لە مۆلچانۆڤکا هەتا گۆریاشکینۆ لە پێنج وێرست زیاتریان ڕێگا لە بەر نەبوو.

لە نێوەڕاستی گوندەکە تووشی پیاوێکی کەڵەکەت بوون کە بە کۆڵانێکدا دەڕۆیشت. پیاوەکە هاتە پێش ئەسپەکە و پرسیی: «ئێوە کێن؟» بەڵام لەڕێوە ڤاسیلی ئاندرێ‌ڤیچی ناسییەوە و دەستی برد

9 Molchanovka

یەکێک لە قوڵەکانی کاشەکەی گرت و هاتە پێشێ هەتا گەیشتە لای کاشەکە و لە سەر لێوارەکەی دانیشت.

ئەو پیاوە مووژیکێک بوو بە ناوی ئیسایی و ڤاسیلی ئاندرێڤیچ دەیناسی و ئەو یەکەم دزی ئەسپ بوو لەو ناوچەیەدا.

ئیسایی کە بۆنی توندی ڤۆدکا لە دەمی دەهات و خۆی بە لووتی نیکیتادا دەکرد گوتی: «ڤاسیلی ئاندرێڤیچ، ئەوە چۆنە ڕێت کەوتوتە ئەم لایە؟»

«دەمانەوێ بچین بۆ گۆریاشکینۆ.»

«ئەی بۆ گەیشتنە ئێرە؟ دەبوو لە مالاخۆڤەوە بڕۆیشتبایەن.»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ هەوساری ئەسپەکەی کێشا کە بە تەواوی ڕایگرێ، وەلامی دایەوە: «بەڵێ، دەبوو زۆر کارمان بکردایە! بەڵام وای لێ هات!»

ئیسایی چاوێکی لە ئەسپەکە کرد و بە دەستە شارەزاکانی و هەڵسوکەوتێکی لێزانانە گرێی کلکە پڕەکەی کە تۆزێ شل بووبۆوە توندی کردەوە و گوتی: «ئەسپی چاکە.»

دیسان گوتی: «دەی، خۆ شەوێ لێرە دەمێننەوە؟»

- نا براکەم، حەتمەن دەبێ بڕۆین!

- کەوابێ کارێکی زەروریتان هەیە. ئەمە کێیە؟ ئا، نیکیتا ستێپانیچ!»

نیکیتا گوتی: «دەی دەتویست کێ بێ؟ خودا بکا هاوڕێ دیسان ڕێگامان لێ نەشێوێ!»

ـ ڕێگاتان بۆ لێ دەشێوێ. وەرسووڕێن و ڕاست بەو کۆڵانەدا بگەڕێنەوە، کە لە گوندەکە چوونە دەرێ، ڕاست بڕۆن. وریا بن بە دەستەچەپدا لانەدەن. کە گەیشتنە سەر ڕێگای سەرەکی، ئەو کاتە بە دەستە ڕاستدا لادەن.

نیکیتا پرسیی: «دەی کە گەیشتینە سەر ڕێگای سەرەکی، بۆ کام لا بایدەینەوە؟ بە زستانەڕێدا بڕۆین یان هاوینەڕێدا؟»

ـ بە زستانەڕێدا، هەر لەو شوێنەی لادەدەن چەند دەوەنی لییە. بەرەورووشی نیشانەیەکی ڕێگای لییە. کۆڵەکەیەکی گەورەی پڕ گرێوگۆڵی لێ چەقاوە. ڕاست لەوێ!»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ سەری ئەسپەکەی وەرسووڕاند و بەرەو دەرەوەی ئاوایی وەڕێکەوت.

ئیسایی لە دوایانەوە هەرای کرد: «بەلام من وای بە باش دەزانم شەو لێرە بمێننەوە!»

بەلام ڤاسیلی ئاندرێڤیچ وەلامی نەدایەوە و بە توندی ئەسپەکەی لێخوڕی. پێنج وێرست ڕێگایان لەبەر بوو کە دوو وێرستی دارستان بوو. کەوایە گرفتێکیان لەبەر نەبوو، بەتایبەت ئەوەی بای نەدەهات و کڕێوە خۆشی کردبۆوە.

دیسان بە کۆڵانەکەدا تێپەڕین کە بەفرەکەی پەستێورابوو و جێجێ پەڵەی پەینوپاڵ ڕەشی داگێرابوو، بە بەر ئەو ماڵەشدا تێپەڕین کە جلەکان بە تەنافەوە بوون و کراسە سپییەکە هێندە بە دەم بایەکەوە شەکابۆوە ئاخری خۆی لە تەنافەکە کردبۆوە و تەنیا بە قۆڵێکییەوە هەڵواسرابوو کە سەهۆڵەکە ڕەقی کردبوو. دیسان بە

پەنای دارە بییەکاندا تێپەڕین کە لە بەر کزەی با ناڵەیان دەهات و گەیشتنەوە دەشتێکی پان و بەربڵاو. بەڵام کە گەیشتنە دەشتەکە نەک زریانەکەی نەخستبوو بەڵکوو زۆر زیاتر لە پێشوو هاژە و گڤەی دەهات. بارِند ڕێگای داپۆشیبوو جگە لە کێلەداری قەراغ ڕێگاکە هیچ شتێکی تر بە دەرەوە نەبوو کە یارمەتیی ڕێبوار بدا بۆ ئەوەی ڕێگای لێ نەشێوێ. بەڵام دیتنی ئەو کێلەدارانەش ئاسان نەبوو چونکە بایەکە بەرەوڕوویان دەهات و ڕاست دەیدا بە سەروچاویاندا. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ مژۆڵی تێک بەزاندبوو و سەری بردبووە پێشێ تاکوو کێلەدارەکان ببینێ، بەڵام نەیدەدی و هەوساری ئەسپەکەی شل کردبوو هیوای بە ئەسپەکە بوو ڕێگاکە بناسێ، ئەسپەکەش بەڕاستی ڕێگاکەی دەناسییەوە و بە هەڵە نەدەچوو. ئەگەرچی ڕێگاکە پێچەڵاوپووچی زۆر بوو بەڵام بە پێەویی ژێر سمیدا هەستی دەکرد و بە ڕاست و بە چەپدا بایدەدایەوە و ڕێگای دەبڕی. ئەگەرچی جار لەگەڵ جار تۆف و باسریشکەکەی توندی دەکرد، کێلەدارەکانی دەدی کە لەمبەر و لەوبەری ڕێگاکەوە چەقابوون و لە لاتەنیشتەوە دیار بوون بەجێ‌دەمان.

بەم شێوەیە ماوەی دە خولەک ڕێگایان بڕی کە لە ناکاو پەڵەیەکی ڕەش لە پێشیانەوە وەدیار کەوت. مسافیری تر بوون کە ئەسپە کوێت پێیان گەیشتبۆوە و سمی لە خێشکی پشتی کاشەکانیان دەدرا.

مسافیرەکانی پێشەوە هاواریان لێ هەستا: «وەرە برۆ... وەرە پێشکەوە!»

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ ویستی بە تەنیشتیاندا بڕوا و وەپێشیان بکەوێ. کاشەکەی دیکە سێ پیاوی وەرزێڕ و ژنێکی تێدابوو. وێدەچوو لە میوانیی جێژن بگەڕێنەوە. یەکێک لە وەرزێڕەکان بە شوولک لە پشتی بە بەفر سپی هەڵگەڕاوی ئەسپەکەی ڕادەکێشا. دوو وەرزێڕی دیکەش کە لە پێشەوەی کاشەکە دانیشتبوون دەستیان ڕادەتەکاند و هاواریان دەکرد بەلام مەعلووم نەبوو دەڵێن چی. ژنەکە خۆی لە شاڵێکەوە پێچابوو و هێندەی بەفر لێ‌نیشتبوو دەتگوت بووکە بەفرینەیە، نێوچاوانی گرژ کردبوو و لە لای دواوەی کاشەکەدا بێ‌جووڵە خۆی کوشمەڵە کردبوو.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ دەنگی هەڵبڕی: «ئێوە کێن؟»

ئەوان دەنگیان بەرز کردەوە و شتێکیان گوت کە بە ڕوونی حاڵی نەبوون: «ئائائا...»

- دەڵێم ئێوە خەڵکی کوێن؟

یەکێک لە وەرزێڕەکان کە پڕ بە گەرووی هاواری دەکرد گوتی: «خەڵکی ئائائا...» بەلام لەگەڵ ئەوپەڕی هەوڵیشی مەعلووم نەبوو خەڵکی کوێن.

یەکێکی تر لە وەرزێڕەکان دەنگی هەڵبڕی: «لێخوڕە، دوا مەکەوە! مەهێڵە پێشمان بکەون!» بە هەموو هێزی خۆی بە شوولک لە پشتی ئەسپە بەستەزمانەکەی ڕادەکێشا.

- وا دیارە لە میوانی دەگەڕێنەوە.

- یاڵڵا، تینی وەبەردە. سیمۆن کوانێ غیرەتت؟ زوو کە زوو!

لاقەبرغەی کاشەکان لە یەک دران. زۆری نەمابوو تێکبگیرێن، بەڵام تێکنەگیران و کاشەی وەرزێڕەکان وەدوا کەوت.

ئەسپە تیسکنە زگزلەکەیان لە ژێر کەوانی کورتی خامووتەکەدا زۆر بە دژواری هەناسەی دەکێشا، دیار بوو بەوپەڕی توانایەوە هەوڵ دەدات و دەیهەوێ خۆی لە وەرزێڕەکە و شوولکەکەی دەستی ڕزگار بکات و بە لاقە قوڵەکانی لە نێو بەفرە قورسەکەدا دەشەلی و هەتا بەرزگی هەلێدەهێنایەوە. لمبۆزی کە جحێڵی دەنواند و لچی ژێرەوەی بۆ سەرەوە هەڵگەڕابۆوە و گوێچکەکانی لە ترسانا بۆ دواوە داتەپاندبوو، چەند چرکەیەک شان بە شانی نیکیتا چووە پێشێ. بەڵام وردە وردە وەدوا کەوت.

نیکیتا گوتی: «ڤۆدکا شێتی کردوون، ئەو ئەسپە بەستەزمانە دەپسێنن! ئاسیایی گەوج و نەفام!»

چەند خولەکێک پڕمەپڕم و هانکەهانکی ئەو چارەوێ بەستەزمانە و هەرا و گاڵەی ئەو گوندنشینە سەرخۆشانە لە پشت سەریانەوە دەبیسترا، بەڵام هانکە و پڕمە بەرە بەرە بێدەنگ بوو و هاوار و هەڵلای پیاوەکانیش دوایی پێ هات. تا وای لێهات جگە لە گڤە و هاژەی با و سیرە و خشەی خێشکی کاشەکان لە سەر ڕەوگەی بەفر بەسەر و بەفرکوش هیچ دەنگێکی تر نەدەهاتە گوێ.

لێکدرانی کاشەی گوندنشینەکان ڤاسیلی ئاندرێڤیچی هێنابووە نەشە و قنج و کەیفخۆش بسکەی سمێڵی دەهات و بە ورەیەکی زیاترەوە ئەسپەکەی لێدەخوڕی ئاگای لە کێلەداری گوێ ڕێگاکە

نـەمـابوو، بـەو هیوایـەی ئـەسـپەکـە خـۆی ڕێگاکـە بدۆزێتـەوە و بیانگەیێنێتە شوێنی مەبەست.

نیکیتا کە کاری بە هیچ نەبوو، هـەروەها خـەمـی هیچیشی نـەبوو، وەک هـەمیـشە لـەو کاتانـەدا وەنـەوزی دەدا تـاکوو بێخـەوییـەکـانی ڕابردووی قەرەبوو بکاتەوە. ئەسپەکە لە ناکاو ڕاوەستا، بە جۆرێک کـە نیکیتـا هێنـدەی نـەمـابوو بـۆ پێشەوە فڕێدرێ و دەمولـووتی بـە لێوارەی کاشەکەدا بدرێ.

ڤاسـیلی ئانـدرێڤـیچ گـوتی: «وا دیـارە دیـسان خۆمـان تووشـی گێچەڵ کرد.»

ـ بۆ چ بووە؟

ـ کێڵەداری گوێ ڕێگاکە لە هیچ کوێوە دیار نین. وا دیارە دیسان ڕێگاکەمان لێ شێواوە.

نیکیتا بە لەبزێکی وشک کوتی: «دەی ئەگەر ڕێگاکـەمـان لـێ ون بووبێ دەبێ دیسان بیدۆزینەوە.»

هەستا و بـازی دا خـوارێ، بـە لاقـە خـوار و پـەیـزەنـەکانییـەوە بـە گورجی وەنێو بەفرەکە کەوت.

ماوەیەکی زۆر بە هەموو لایەکدا ڕۆیشت و هەموو جارێ لـە چـاو ون دەبـوو، دیـسان وەدیـار دەکـەوتـەوە و دیـسان بـزر دەبـۆوە، تـا ئاخری هەڵتەک هەڵتەک هاتەوە بۆ لای کاشەکە.

سواری کاشـەکە بۆوە، دانیشت و گـوتی: «نـا، لـەم لایانـەوە ڕێگا ئاسەواریشی نییە. دەبێ دوورتر بڕۆین. بەڵکوو بیدۆزینەوە.»

هـەوا خـەریـک بـوو ورده ورده تاریـک دادەگـەڕا. تـۆفـوبـەنـد و باڕووشک هێدی نەبووبوو بەڵام توندتریشی نەکردبوو.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ گوتی: «خۆزگە دیسان گوێمان لـە دەنگی ئـەو وەرزێڕانە بووایە.»

- بەڵێ، خۆ دیتت لـە پێمـان دەرنـەچـوون. حـەتمـەن زۆر بـە لاڕێدا ڕۆیشتووین. بەڵام لەوانەیە ئەوان ڕێگایان لێ شێوابێ!

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ گوتی: «ئێستا بۆ کام لا بڕۆین؟»

نیکیتا گوتی: «دەبێ هەوساری ئەسپەکە شل کـەین، خـۆی ڕێگاکـە دەدۆزێتەوە. دادەی ئەو هەوسارە بدە بە من!»

ڤاسیلی ئانـدریێڤیچ هـەوسـارەکـەی دایـە دەسـت نیکیتا. لـە خـودای دەویست، چونکە بـەو دەسـتەوانـە گـەرم و نـەرمانـەشـیەوە پـەنجـەی تەزیبوون و گۆیان نەدەکرد.

نیکیتا قایشی هەوسارەکەی بە دەستەوە گرت، بـەڵام هـەوڵـی دەدا نـەیکێشێت و نـەیجـووڵێنێ و ئـەسپەکـە ئـازاد بکـات، بـەڵکە بـە هـۆی خۆمــاک و ورییایـیــەوە ڕێگاکــە بدۆزێتــەوە. ئــەو ئــەســپەی زۆر خۆشدەویست و دڵی پێی خۆش بوو، هەر بەڕاستیش ئەسپێکی وریـا و بەهۆش بوو، هەرجارەی گوێچکەیەکی قوت دەکردەوە و بـە ڕاسـت و چەپ دەیسووڕاند و دیار بوو لە ڕێگاکە دەگەڕێ.

دەیگوت: «تـەنیا حـەیفێکی هـەیـە قسە ناکـا، تـۆ سـەیری بکـە چـی دەکا!» بە ئەسپەکەشی دەگوت: «بڕۆ بڕۆ، باوکەکەم. ئەرێ ئەرێ، تـۆ خۆت لە ئێمە باشتر دەزانی بۆ کام لا بڕۆی!»

ئێستا با لە دواوە لێی دەدان و سەرماکە زۆری ئازار نەدەدان.

هەروا کە خەریکی پەسن و تاریفاتی ئەسپەکە بوو گوتی: «ئەو ئاژەڵە بێزمانە چەندە وریا و بەهۆشە! ئەو ئەسپە قرقیزییەی دیکەت زۆر بەهێزە، بەڵام قەزای کەرێکی لێکەوێ. ئێستا چاو لەمەیان بکە، دیتووتە چۆن گوێچکەی دەلەقێنێ. هەر دەڵێی تێلگەرافە، لەویش چاکترە! لە یەک ویرستەوە هەموو شتێک تێدەگا.»

هەر بەڕاستیش نێو کاتژمێری نەخایاند، لە دوورەوە بەرەوڕوویان پەڵەیەکی ڕەش وەدیار کەوت. بەڵام مەعلووم نەبوو دارستانە، یان ئاوایی. لە لای راستیشەوە کێلەدارەکانی گوێ جادەکە وەدیار کەوتن. دیار بوو دیسان کەوتوونەتەوە سەر ڕێگاکە.

نیکیتا لە ناکاو گوتی: «ئێرە خۆ دیسان مۆلچانۆڤکایە!»

هەر بەڕاستیش ئەو ئەمبارە بوو کە سەربانەکەی پڕ بوو لە بەفر و با بە هەموو لایەکدا گێژی دەدا و بۆنێو کۆڵانەکەی ڕادەماڵی. هێندێ لەولاترەوە دیسان تەنافەکە جلوبەرگە بەستووەکانی هەروا پێوە هەڵواسرابوون، هەر ئەو کراس و سۆرانی و تەنوورە بوون کە پێشتر دیتیان و بە دەم کزەباوە دەشەکانەوە.

دیسان خۆیان کرد بە نێو کۆڵانەکەدا و دیسان بایەکەی خست و هەواکەی گەرمتر و نەشەبزوێنتر بوو، دیسان پەینی نێو کۆڵانەکە ڕەش دەچوونەوە و دیسان دەنگی ئاخافتن و گۆرانی، سەگەکەش دیسان دەستی کرد بە وەڕین. هەواکەی ئێتر وا تاریک بووبوو کە هێندێ لە پەنجێرەکان ڕووناکییان تێگەڕابوو.

کە گەیشتنە نیوەڕاستی کۆلانەکە ڤاسیلی ئاندریێڤیچ ئەسپەکەی لە بەر ماڵێکی گەورەی دارینەدا ڕاگرت کە دوو ڕەگی دیوارەکەی کەرپووچ بوو.

نیکیتا ڕۆیشت بۆ بەر پەنجەرەیەک کە پێشەکەی بەفری لێ نیشتبوو، کلووی بەفر لە هەموو لایەکەوە دەفڕی و لەبەر ڕووناکایی پەنجەرەکە دەدرەوشانەوە، بە دەسکی قامچییەکەی لە شووشەکەی دا. دەنگێک لە وەڵامدا هاتە گوێ: «کێیە؟»

نیکیتا وەڵامی دایەوە: «بێرخوونۆڤ، لە کریستییەوە، بێزەحمەت وەرە دەرێ براکەم!»

کەسێک کە لە پشت پەنجەرەکە بوو دوور کەوتەوە و دوو خولەک دواتر دەرگای حەوشەکەی بە زۆر کردەوە کە بەفر و سەهۆڵ پێوەی جەڕی دابوو. پاشان تەقەی چلمێردەی دەرگایەکی تر هاتە گوێ و پیرەپیاوێکی کەڵەگەت و ڕیش‌سپی کە کوڵەباڵێکی کەڵپۆسی دابوو بە شانیدا و لە ژێر ئەویشەوە کراسێکی خاوێنی جێژنی لەبەرکردبوو، بە دوای ئەویشدا گەنجێکی چەکمە لەپێ بە کراسی سوورەوە هاتە دەرێ و دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە کپ کرد کە با نەیکاتەوە.

پیرەپیاو گوتی: «تۆ کێی؟ ئاندریێڤیچ؟»

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ گوتی: «بەڵێ، دەچووین بۆ گوریاشکینۆ ڕێگامان لێ شێوا. دەمانهەویست بچین بۆ گوریاشکینۆ کەچی ڕێمان کەوتە ئێرە. پێشتریش هاتین بۆ ئێرە و پرسیارمان کرد بەڵام ڕۆیشتین و دیسان گەڕاینەوە.»

پیرەپیاو گوتی: «حاح، چا بووە سەرماش نەیبردوون!» بە گەنجە کراسسوورەکەی گوت: «پترووشکا، بڕۆ خێرا دەرگاکەیان بۆ بکەوە!»

گەنجەکە گورجوگۆڵ و بەنەشە هەڵات بۆ لای دەرگاکە و گوتی: «بەڵێ باش، هەرئێستا!»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ گوتی: «بەڵام ئێمە شەو لێرە نامێنینەوە.»

- ئەی بەو ئێوارە درەنگوەختە دەتانەوێ بچن بۆ کوێ؟ دەبێ لێرە بن!»

- زۆر سپاس، ئاوەدان بێ. ئەگەر بەپەلە نەبوایەین، لە خودامان دەویست لە لاتان بمێنینەوە. بەڵام دەبێ برۆین.

- باشە لانیکەم وەرنە ژووری خۆتان گەرم کەنەوە. سەماوەرەکە تێخراوە، چاییەک بخۆنەوە.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ گوتی: «باشە دێین خۆمان گەرم دەکەینەوە. خۆ هەواکەی لەوە تاریکتر نابێ. مانگیش هەڵاتووە و ڕێگاکە ڕووناک دەکاتەوە. باشە، دێینە ژووری، خۆمان گەرم دەکەینەوە و دوایی وەڕێدەکەوین.»

نیکیتا کە هەتا مۆخی ئێسقانەکانی تەزیبوو و حەزی دەکرد بچێتە ژووری و خۆی گەرم بکاتەوە گوتی: «بەڵێ دەچینە ژووری. با بچین خۆمان گەرم بکەینەوە!»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ لەگەڵ پیرەپیاوەکە چووە ژووری و نیکیتا بە کاشەکەوە لە دەروازەی حەوشەکە چووە ژووری کە پترووشکا بۆی کردبۆوە و بە ڕێنوێنیی ئەو ئەسپەکەی بردە ژێر هەیوانی داهاتووی

ئـەمبارێـک. تـەرکـی هـەیوانـەکـە بـە پـەیـن داپۆشـرابوو و کـەوانـی خاموتەکە لـە دەستەکی چەماوەی میچەکە گیرا. ئـەو کەڵەشێر و مریشکانەی لـە سـەر دەستەکـەکە هـەڵنیشتبوون و خـەوەکـەیان لـێ شـێوابوو دەسـتیان کـرد بـە قیـرەقیـر و باڵـەفڕکـێ و مـەڕەکـان کـە سڵەمیبوونەوە لە سەر پەین و پشکەڵەکەیان تێک قژقژابوون و سمیان لە عەرزی دەکوتا و لە پێش ئەسپەکەوە ڕەویان دەکرد و دەچوونە دواوە. سەگەکەش تۆقیوانە و ڕقکردوو دەوەڕی و وەڕینەکەی هێندە دڕ و ڕقهەستاوانە بوو دەتگوت تووتکی چکۆلەیە و دەقورووسکێنێ.

نیکیتا لەگەڵ هەموویان قسەی دەکرد. داوای لێبووردنی لە کەڵـەبـاب و مریشـکەکـان دەکـرد و دەیلاواندنـەوە و متمانـەی پێ‌دەدان کـە ئێتـر نایان‌ترسێنێ و مەڕەکانی سـەرکۆنە دەکرد کە ئـەوەنـدە ترسـەنـۆکن و خۆیـشیان نـازانن لـە چـی دەترسـن، لـەگـەڵ ئـەوەی ئـەسـپەکـەی دەبەستەوە بەردەوام سەگەکەی نەسیحەت دەکرد کە ئاقڵ بێ و هـەدا بدا.

دوای ئەوانە بەفرەکەی لـە سـەر شـانوملی خـۆی تـەکاند و گـوتی: «چاکە، ئێستا ئێتر کارەکە جێبەجێ دەبێ.» پاشان بە سـەگـەکـەی گوت: «ئای ئای، تۆ بۆ ئاوا گەرووی خۆت دەدڕێنی؟ باشە بەسـی‌کـە ئێتـر، هـەدا بـدە ئێتـر. تـەنیـا خـۆت ئـازار دەدەی. خـۆ مـن دز نـیم، ناسیاوم...»

کوڕە گەنجەکەش کە بە شان‌وباهۆی بەهێزەوە پاڵی بە کاشەکەوە نا تاکوو بە تەواوی بچێتە ژێر میچەکە و لە بەر بەفرەکە نەبێ گوتی:

«ئەوانەش ڕاویژکارانی ماڵمانن، وەکوو ئەو چیرۆکەی لە نێو کتێبدا نووسراوە!»

نیکیتا گوتی: «ڕاوێژکارەکانتان کێن؟»

کوڕە بە پێکەنینەوە گوتی: «ئەو چیرۆکە وا لە کتێبی پاڤلسێندا نووسراوە. دزە بە پارێزەوە خۆ دەکا بە ماڵەکەدا. سەگە دەوەڕێ کە 'خاوەن‌ماڵ وریا بە خەو نەتباتەوە!' کەڵەشێر دەخوێنێ کە: 'هەستە لە خەو خاوەن‌ماڵ!' پشیلە دەمیاوێنێ کە 'خاوەن‌ماڵ ئاگادار بە میوانی خۆشەویست دێ و ڕێزی لێ بگرە.'»

پترووشکا کوێرەسەوادێکی هەبوو و کتێبەکەی پاڤلسێن تەنیا کتێبێک بوو کە هەیبوو، هەمووشی لە بەر دەزانی و بەتایبەت کاتێک کە وەک ئەمشەو سەرقاڵ دەبوو حەزی دەکرد ئەو چیرۆکانەی کە لەگەڵ بارودۆخەکە یەک دەگرێتەوە، بیگێڕێتەوە.

نیکیتا گوتی: «وایە، ڕاست ئەو جۆرەیە کە باست کرد!»

پترووشکا گوتی: «پێموابێ زۆرت سەرمایە و ئازای ئەندامت تەزیوە، مامە گیان!»

نیکیتا گوتی: «وایە، بەڕاستی خەریکە قرم دێ.» پێکەوە چوون بۆ ئەوبەری حەوشەکە و خۆیان کرد بە ژووریدا.

## (٤)

ئەو ماڵەی کە ڤاسیلی ئاندرێڤیچ لێی لادابوو ماڵی یەکێک لە سامانداراترین وەرزێڕەکانی ئەو گوندە بوو. ئەو بنەماڵەیە پێنج پەڵە زەویی خۆیان هەبوو، چەند پەڵەشیان لە خەڵکی بە ئیجارە دەگرت. شەش ئەسپ و سێ مانگا و دوو نگوونکی بەرکەڵ و هەشت سەر مەڕیان هەبوو. بنەماڵەکەیان١٠ بیست و دوو سەر خێزان بوون. پیرەپیاو چوار کوڕی هەبوو کە هەموویان خاوەن ژن و ماڵ بوون، شەش نەوە، کە دووانیان ژنی بۆ هێنابوون و یەک لەوان پترووخا١١ بوو. دوو منداڵیش کە نەبیرەی پیرەپیاوەکە بوون. سێ منداڵی هەتیو و چوار بووک، لەگەڵ منداڵەکانیان. خاوەنی یەکێک لە باشترین ملکەکان بوون کە هێشتا بەش‌بەش نەکرابوو، بەڵام وردە وردە خەریک بوو تۆوی ناکۆکی لە نێویاندا ڕیشەی دادەکوتا، هەروەک ئاساییە، سەرەتا لە نێو ژناندا دەستپێدەکا و زۆر زوو ناچار دەبن دەستبکەن بە بەش کردن و لەتوکوت کردنی ماڵ و مەزراکان و لێکهەڵبڕان و جیا

---

10 ئەم بنەماڵەیە نموونەی بنەماڵەیەکی باوکسالاری ڕووسیایە کە باوک و دایک لە ماڵێکدا کوڕ و بووک و منداڵەکانیان کۆ دەکەنەوە و هەتا ئەو کاتەی ماڵ و سامانەکەیان دابەش نەکردووە و هەرکەس بەشی خۆی وەرنەگرتووە دەبێ لە ژێر فەرمانیاندا بێ و عەولاد نابێ لە قسەیان دەرچێ و سەرپێچی کردن لە فەرمانی باوک بە تاوانێکی گەورە و دژی نەریتی باو دێتە ئەژمار.

11 پترووخا و پترووشکا، سووکەڵەی ناوی پیووتێرن

بوونەوە. دوو دانە لە کوڕەکان لە مۆسکۆ دەژیان و بەرمیلئاژۆ بوون و ئاویان دابەش دەکرد. کوڕی سێهەمیشی سەرباز بوو. ئەو شەوە پیرەپیاو و ژنەکەی لە ماڵێ بوون و کوڕی دووهەمیان کە بەسەر کاروباری مڵکەکەیاندا ڕادەگەیشت، هەروەها کوڕی گەورەیان کە لە مۆسکۆ هاتبۆوە و هەموو ژن و منداڵەکانیان، جگە لەوەش دراوسێیەکیان کە باوەپیارەی یەکێک لە منداڵەکانیان بوو، بۆ میوانی هاتبوو بۆ ماڵەکەیان.

لامپاکەیان لە سەر مێزەکە دانابوو، بە شووشەیەکی ناوقەد باریکەوە، کە پەرداخ و ژێرپیاڵە و بتریی ڤۆدکا و کەلوپەلەکانی تری ڕووناک کردبۆوە و شۆقەکەی لە دیوارە کەرپووچەکە و وێنەی پیرۆزی سووچی ژوورەکەی دەدا کە بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوو و دو وێنەی تریش لەملا و ئەولای وەبەرچاو دەکەوت. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ لە سەرووی مێزەکەوە دانیشتبوو، بەو باڵتە ملیوانە تیسکنە ڕەشەیەوە خۆی قیت کردبۆوە و لێوی بە سمێڵە خووسار لێنیشتووەکەیدا دەهێنا، دەیمژی و بە چاوی زەق و بایەقووشئاساییەوە چاوی لە ئامادەبووان دەکرد. پیرەپیاوی خاوەنماڵ شان بە شانی دانیشتبوو کە سەری بێتووک و ڕیشە سپییەکەی لەبەر شۆقی چراکە بریقەی دەهات و فانیلەیەکی دەستچنی سپیی لە بەردا بوو، لەولای ئەویشەوە کوڕەکەی دانیشتبوو کە لە مۆسکۆوە بۆ سەردانی بنەماڵەکەی هاتبۆوە. کراسێکی چیتی لە بەردا بوو و قەلافەتە بەهێز و لەشە ساغەکەی زیاتر دەکەوتە بەرچاو، هەروەها کوڕێکی تریان کە لاوێکی چوارشانە بوو و بە سەر

کاروباری ملکەکەیاندا ڕادەگەیشت، جگە لەوانە وەرزێرێکی لاوازی سوورهوول لەوبەری کورسییەکە دانیشتبوو کە ئەویش میوانیان بوو.

ئەو وەرزێرانە کە ڤۆدکایان خواردبۆوە و خواردنیان لەگەڵ خواردبوو، چاوەڕوانی چایی بوون و سەماوەرەکەش لە نزیک سۆباکە و لە سەر تەرکی ژوورەکە دەکولا و هەڵمی لێهەڵدەستا. لە سەروو سۆبا دیوارییەکەوە و لە سەر هەرزاڵی نێوان سۆبا و دیوارەکە، منداڵەکان خەوتبوون. ژنێک لە سەر تەختێک دانیشتبوو و لانکەیەکی ڕادەژاند. پیرێژنی خاوەنماڵ کە دەموچاوی و تەنانەت لێویشی بە هۆی چرچولۆچ و شۆقی چراکەوە دەتگوت تۆڕی بە سەردا کێشراوە خەریکی خزمەتکردن و بەخێرهاتنی ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بوو.

کاتێک نیکیتا هاتە ژووری پیرێژن ڤۆدکایەکی کردبووە نێو پەرداخێکی ئەستوورەوە و خەریک بوو دەیبرد بۆ میوانەکەیان.

ڕووی لە میوانەکەیان کرد و گوتی: «فەرموون، ڤاسیلی ئاندرێڤیچ، ئێوە شایانی خزمەتی لەوە زیاترن. بەڵام چونکە جێژنە لێوێک تەڕ بکەن باشە، تکایە گەورەیی بنوێنە و پێکێک هەڵدە، نۆشی گیانت بێ!»

دیتنی ڤۆدکا و بۆنەکەی، بەتایبەت ئێستا، بۆ نیکیتا کە لە سەرمانا کەسیرە بووبوو و لە بەر شەکەتی خۆی بە پێوە نەدەگرت، بەجاری شڵەژاندی و نێوچاوانی پێ گرژ کرد. بەفری سەر کڵاو و کەڵپۆسەکەی تەکاند و لە بەردەمی وێنەی پیرۆزدا ڕاوەستا، وەک ئەوەی هیچ لە ژوورەکەدا نەبێ، سێ جار خاچی خۆی کێشا و

کڕنۆشی برد. پاشان ڕووی له پیرەپیاوی خاوەنماڵ کرد. دەستی بە سینگییەوە گرت و سەرەتا لە پیرەپیاو و پاشان لە دانیشتووانی سەر مێزەکە و دوای ئەویش لەو ژنانەی کە لە نزیک سۆباکە ڕاوەستابوون سڵاوی کرد ولەگەڵ ئەوەی کڕنۆشی دەبرد گوتی: «جێژنتان پیرۆز بێ!» بێئەوەی چاو لە ڤۆدکا و پەرداخی سەر مێزەکە بکا، دەستی کرد بە داکەندنی باڵتە و جلەکانی سەرەوەی.

برا گەورەکەیان چاوی لە دەموچاو و ڕیشی بەفراوی و چاوانی نیکیتا کرد و گوتی: «تۆ بە جارێ بووی بە پیاوەبەفرینەیەکی حیسابی، براکەم!»

نیکیتا کەڵپوسەکەی داکەند و دیسان تەکاندی، لە پشت سۆباکە هەڵیواسی و ڕۆیشت بۆ لای مێزەکە. داوایان لە ئەویش کرد ڤۆدکا بخواتەوە. کێشە و خۆڕاگرییەکی تاڵ لە ناخی نیکیتادا هەڵایسا. هێندەی نەمابوو پەرداخەکە وەرگرێ و بینی پێوەنێ. بەڵام کە چاوی بە ڤاسیلی ئاندرێڤیچ کەوت سوێندەکەی خۆی وەبیر هاتەوە، هەروەها چەکمەکانی کە لە سەر ڤۆدکا دۆڕاندبووی و کابرای بەرمیلبەند کە لەگەڵ ژنەکەی دەژیا و کوڕەکەی کە بەڵێنی پێدابوو بەهارێ ئەسپی بۆ بکڕێ، هەناسەیەکی هەڵکێشا و پەرداخەکەی وەرنەگرت.

نێوچاوانی گرژ کرد و گوتی: «دەستتان خۆش بێ. نۆکەری ئێوەم. من ڤۆدکا ناخۆمەوە!» ئەوەی گوت و لەسەر کورسیلەیەکی بەر پەنجێرەی دووهەم دانیشت.

برا گەورەکەیان گوتی: «چۆن ڤۆدکا ناخۆیەوە؟»

نیکیتا بێئەوەی سەری هەڵێنێ، لە ژێر چاوەوە لە سمێڵ و ڕیشە تەنکەکەی خۆی ڕوانی و لەگەڵ ئەوەی لەتکە سەهۆڵەکانی لێدەکردەوە گوتی: «ناخۆم ئیتر، من ڤۆدکا ناخۆمەوە!»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ، کە دوای خواردنەوەی ڤۆدکاکە پەنچکێ نانی دەجاوی گوتی: «باش نییە بۆی، نەیخواتەوە باشترە!»

پیرێژن بە مێهرەبانییەوە گوتی: «باشە، کەوایە پیاڵەیەک چایی بخۆوە! حەتمەن لە سەرمانا هەموو گیانت بەستوویە!» ڕووی لە بووکەکانی کرد و گوتی: «ئێوە ژنان، ماتڵی چین؟ ئەی چایی بوو بە چی؟ بۆ نایهێنن؟»

یەکێک لە ژنە جحێڵەکان بە لۆی پەردەکە سەری سەماوەرەکەی سڕی کە خەریک بوو هەڵدەچوو، گوتی: «سەماوەرەکە کوڵاوە.» سەماوەرە قورسەکەی هەڵگرت و بە قولتەقولت هێنایە پێشێ و هەڵیهێنا و لە سەر مێزەکە داینا. لەو کاتەدا ڤاسیلی ئاندرێڤیچ باسی سەرلێشێوان و دیسان گەڕانەوەی خۆیانی دەکرد بۆ گوندەکە و هەروەها ئەو گوندنشینە سەرخۆشانەی کە لە ڕێگا تووشیان بووبوون. ئامادەبووان بە سەرسووڕمانەوە هەوڵیان دەدا بزانن بۆ ڕێگاکەیان لێشێواوە و ئەو گوندنشینە مەستانە ڕێنوێنییان نەکردوون کە ئاوا تووشی کێشە و سەرلێشێواوی نەبن. دراوسێکەیان کە لەوێ میوان بوو گوتی: «لێرەوە هەتا گۆریاشکینۆ ڕێگاکەی سەرڕاستە. منداڵێکیش دەتوانێ بە ئاسانی بچێت و ڕێگای لێ نەشێوێ. بەڵام دەبێ وریا بی لە کوێ بە جادەی سەرەکیدا لادەی. دارێکی کوڵەبنە لە

قەراغ ڕێگاکەیە و لە دوورەوە دیارە. حەتمەن ئێوە بەر لەوەی بگەنە لای دارەکە، بە لای ڕاستدا لاتانداوە!»

پیرێژنی خاوەنماڵ هەوڵی دەدا پێملیان بکات بمێننەوە و گوتی: «ئێوە دەبێ ئەمشەو لێرە بمێننەوە! بووکەکانم جێگاوبانتان بۆ ڕادەخەن!»

پیرەپیاو بۆ پشتڕاست کردنەوەی وتەی ژنەکەی گوتی: «بەیانی زوو وەڕێبکەون و بەڵکوو هەواکەی خۆشتری بکات و مەترسیشی کەمترە!»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ گوتی: «نا، ناکرێ براکەم! کارم هەیە، دەبێ هەرچی زووتر لەوێ بم!» لێرەوارەکەی وەبیر هاتەوە و ئەو دارفرۆشانەی کە وەک داڵ بە سەریەوە دەگەڕان و دەیانقۆستەوە، گوتیشی: «سەعاتێک لە خۆت غافڵ بی، دەبێ ساڵێک خەم بخۆی و ناخی بۆ هەڵکێشی، چونکە ئاوی ڕۆیشتوو تازە بە جۆگەدا ناگەڕێتەوە!» ڕووی لە نیکیتا کرد و گوتی: «دەی، بڕۆین؟»

نیکیتا ماوەیەک وەڵامی نەدایەوە، دەتگوت هەروا خەریکی لێکردنەوەی زوقم و سەهۆڵی ریش و سمێڵیەتی. پاشان بەبێ تاقەتییەوە گوتی: «ئەگەر دیسان ڕێگامان لێ تێکنەچێ!»

بێتاقەتییەکەی نیکیتا لەبەر ئەوە بوو کە زۆری حەز لە هەڵدانی پێکێک ڤۆدکا بوو و تەنیا شتێک کە دەیتوانی ئەو ئێشتیایەی دامرکێنێ و بۆی ببێتە مرووشکێن، پیاڵەیەک چایی بوو، بەڵام هیچ کەس لە بیری ئەوەدا نەبوو پیاڵەیەکی چایی بۆ بێنێ.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ گوتی: «هەر ئەوەندە هەتا سەری پێچەکە بە سلامەتی بگەینێ، ئیتر لەوە بەولاوە هەتا شوێنی مەبەست هەر دارستان و لێرەوارە.»

نیکیتا کە ئاخری پیاڵەیەک چاییان بۆ هێنا و لە بەردەمی دایاننا، گوتی: «هەرچی ئێوە بفەرموون، ڤاسیلی ئاندریێڤیچ! ئێوە بڵێن دەڕۆین، دەڕۆین!»

- پیاڵەیەک چایی دەخۆینەوە و پاشان وەڕێ دەکەوین!

نیکیتا هیچی نەگوت و تەنیا سەری لەقاند، زۆر بە شێنەیی و پارێزەوە چاییەکەی کردە نێو نالبەکەییەکەوە و دەستی بە قامکە هەمیشە بە کار ماسیو و جەمامەکەیەوە بە سەر هەڵمی گەرمی چاییەکەدا گرت و گەرمی کردەوە، پاشان کلۆیەک قەندی خستە دەمیەوە، کڕنۆشێکی بۆ خانەخوێکەی برد و گوتی: «بە خۆشیتان!» پاشان چاییەکەی بە گەرمی هەڵقوڕاند.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ گوتی: «دەکرێ کەسێک هەتا سەری پێچەکە لەگەڵمان بێ و ڕێگاکەمان پیشان بدا؟»

کوڕە گەورەکەی خاوەنماڵ گوتی: «بۆ ناکرێ؟ خۆ پیاوەتی هەڵنەگیراوە؟ پترووخا ئەسپەکە لە کاشە دەکات و هەتا سەری پێچەکە لەگەڵتان دێ.»

- زۆر چاکە، بچۆ ئەسپەکە ئامادە بکە، ئەو پیاوەتییەمان لەگەڵ بکە! خودا خێرت وەڕێبێنێ!»

پیرێژنی خاوەنماڵ بە دڵسۆزییەوە گوتی: «بابم پیاوەتیی چی؟ خۆ چاکە هەڵنەگیراوە!»

برا گەورەکە گوتی: «پترووخا، هەڵی ماینەکە لە کاشە ببەستە و ئامادەی کە.»

پترووخا بە پێکەنینەوە گوتی: «بە سەرچاو، هەرئێستا دەچم!» بە پەلە کڵاوەکەی لە بزماری سەر دیوارەکە کردەوە و ڕۆیشتە دەرێ تاکوو کاشەکە ئامادە بکا.

لەو ماوەیەدا هەتا پترووخا ماینەکەی ئامادە کرد، گەڕانەوە سەر باسەکەی پێشوویان کە بە هاتنی ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بۆ پشت پەنجێرەکە بڕیبوویان. پیرەپیاوی خانەخوێ دەردەدڵی بۆ میوانەکەیان دەکرد کە کوێخای گوندەکەی نزیکیان بوو، قسەکانی بۆنی گلەیی لێدەهات و لەوە نارازی بوو کە کوڕی سێهەمی بە بۆنەی جێژنەوە هیچ دیارییەکی بۆ ئەو نەناردووە، کەچی لەچکەیەکی فەرەنسی بۆ ژنەکەی ناردووە.

پیرەپیاو گوتی: «لاوەکان ئیتر خەریکن دەفەوتێن. وا سەرەڕۆ بوون ئیتر هیچ کەس باشاریان ناکا. زەمانە گۆڕاوە ئیتر. ئەوان بە پێشکەوتن و کەماڵ گەیشتوون. دیتووتە دیمووچکین١٢ چۆن لە باوکی خۆی داوە و دەستی شکاندووە. پێشکەوتن و کەماڵیان ئەوەیە ئیتر!»

نیکیتا گوێی شل کردبوو. هەموو بیر و هۆشی لەلای قسەکانیان بوو. بە وردی سەرنجی دەدان و دیار بوو دەیهەوێ لە وتەکانیاندا بەشداری بکات و بیروڕای خۆی دەربڕێ، بەڵام چایی بە دەستەوە بوو و تەنیا سەری دەلەقاند و قسەکانیانی پشتڕاست دەکردەوە.

---

12 Dyemoutchkin

چایی لە دوای چایی دەیخواردەوە و لەگەڵ خواردنەوەی هەر چاییەک هەستی دەکرد گیانی گەرم دەبێتەوە و ماندوویی دەحەسێتەوە. ئەو دەمەتەقێیە ماوەیەکی زۆری خایاند و بەردەوام قسەکانیان لەو بوارەدا و لە سەر ئەو بابەتە بوو، یانی دابەشکردنی ملکوماڵ و سەربەخۆ بوونی عەولاد و بەڕێوە بردنی ماڵ و ژیانی خۆیان. دیار بوو ئەو باسوخواسە لە سەر شتێکی گشتی نییە و تەنیا مشتومڕەکەیان لە سەر دابەشکردنی ملکوماڵە لە نێوان کوڕانی بنەماڵەکەدا و کوڕی دووهەم، کە هەر لەوێ دانیشتبوو ملی بە خوزدا گرتبوو و دیار بوو لە سەر ئەوە پێداگری دەکا. دیار بوو مەسەلەکە زۆر بە شوێنێکی ناسک گەیشتووە و هەموو ئەندامانی بنەماڵەی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە و تووشی دڵەخورپەی کردوون، بەڵام بۆ پاراستنی ئابڕوو و لەبەرچاو گرتنی ئەدەب و حەیا لە هەنتەشی بێگانەکاندا، بە ئاشکرا نەدەچوونە سەر باسی تایبەتی خۆیان و خۆیان لێ دەبوارد. بەڵام پیرەپیاو لەوە زیاتر خۆی پێ ڕاگیر نەکرا و بە دەنگێکی خەمتێزاو و لەرزۆکەوە گوتی هەتا خۆی زیندوو بێ، ماڵ ماڵی خویەتی و قەتی دابەش ناکا. شوکری خوداش دەکا کە ماڵ و ژیان و سامانی هەیە و ئەگەر دابەشی بکات ئەوەشیان لە دەست دەبێتەوە و دەکەونە سواڵ.

پیرەپیاوی جیرانیان گوتی: «بەڵێ، ڕاست وەکوو بنەماڵەی ماتڤییێڤ١٣، ملکی گوندێکیان هەبوو. دابەشیان کرد و هەموویان لە دەست بۆوە. ئێستاش هەموو هەڕاڵ و گەڕاڵ و سەرگەردانن!»

---

13 Matvyeyev

پیرەپیاو ڕووی لە کوڕەکەی کرد و گوتی: «ئەوەتا، تۆ ئەوەت دەوێ؟»

کوڕە وەڵامی نەدایەوە و هەموو بێدەنگ بوون، بێدەنگییەکی تاڵ و ناخۆش، پترووخا کە ماینەکەی ئامادە کردبوو و چەند خولەکێک بوو هاتبۆوە ژووری، بێدەنگییەکەی شکاند و هەروا بە ڕوویەکی خۆش و دەم بە پێکەنینەوە گوتی: «پاڤلسین هەقایەتێکی هەیە ڕاست بەو شێوەیە. باوکەکە باخەیەک شوولک پێکەوە دەبەستێ و دەیداتە دەست کوڕەکانی تاکوو بیشکێنن، بەڵام هیچیان بۆیان ناشکێ، بەڵام کاتێک دانە دانە دەیداتە دەستیان، شوولکەکان ورد دەکەن. ئەمەش ڕاست وایە.» ئەوەی گوت و لەگەڵ ئەوەی بە بزەیەک ڕیزی ددانە سپییەکانی وەدیار کەوت گوتیشی: «ماینەکە ئامادەیە!»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ گوتی: «ئامادەیە، کەوایە وەڕێ دەکەوین!» پاشان ڕووی لە پیرەپیاو کرد و گوتی: «بەڵام بۆ دابەش کردنی ملکەکەت، بە قسەی من دەکەی پێمل مەبە، باوەگەورە! ئەم ملک و زەوی‌وزارە خۆت بە ڕەنجی شانت پێکەوەت ناوە و دەبێ لە دەستی خۆتدا بێ. ئەگەر زۆریشیان بۆ هێنای بچۆ سکالانامەیان لە دژ بنووسە. دادگا خۆی کارەکە جێبەجێ دەکا!»

پیرەپیاوی خانەخوێ هەروا درێژەی بە قسەکانی دا: «بەردەوام بۆڵەی دێ! سەری لە کێشە دەخورێ و ماڵەکەی بە یەکدا داوە. نە هیچ کەس دەرۆستی دێ، و نە بە هیچ شتێک ڕازی دەبێ. سواری کەری شەیتان بووە و بە ئامان و زامان دانابەزێ!»

لەو سەروبەندەدا کە نیکیتا پێنجەمین چایی بە گەرمی هەڵقوڕاندبوو، هێشتا پەرداخی چاییەکەی ئاوەژوو نەکردبۆوە و بە هیوا بوو دیسان چایی بۆ تێکەن. بەڵام سەماوەرەکە چۆڕەی لێ بڕابوو و کە سەری هەڵێنا دیتی ڤاسیلی ئاندرێڤیچ خەریکی خۆپێچانەوەیە و ئیتر لە خواردنەوەی چایی هیوابڕاو بوو. چاری نەبوو ئەویش هەستا. کڵۆ قەندێکی گەورە کە لە هەموو لایەکەوە وەبەر گازی دابوو خستیەوە نێو قەندانەکە. دەموچاوی بە ئارەقە خووساوی بە ئاتەگی کەڵپۆسەکەی سڕی و ڕۆیشت بۆ لای کوورەکە و دەستی دا باڵتەکەی لە بەری بکات.

باڵتەکەی لە بەر کرد. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و سپاسی لە خانەخوێکە کرد و دوای ئەوەی خوداحافیزی لێکردن، لە ژوورە گەرم و ڕووناکەکەوە پێی نایە داڵانە سارد و تاریکەکە، کە بایەکی سارد گڤە و هاژەی دەهات و بە درز و کەلێنی دەرگا شڕەکەدا دەهاتە ژوورێ و بەفری لەگەڵ خۆیدا دەهێنا، لەوێشەوە پێی نایە نێو حەوشە پڕ بەفر و تاریکەکەوە.

پترووخا باڵتە لەبەر و ئامادە بە ماینەکەیەوە لە نێوەڕاستی حەوشەکە ڕاوەستابوو و بە دەم پێکەنینەوە شیعرێکی پاڤلسێنی دەخوێندەوە:

*بادەوە و توف و تاریکی*

*سەری گەیشتوتە فەلەک*

*بەفر بە دەم باڕووشکەوە سەری لە ئاسمان دەسوێ*

*هێندێ جار وەک گورگی برسی دەلوورێنێ و*

*هێندێ جاریش وەکوو زارۆک دەزیرێنێ.*

نیکیتا بۆ ئەوەی وا بنوێنێ شێعرەکەی بە دڵە، سەری بۆ دەلەقاند و هەوساری ئەسپەکەی بە دەستیەوە ئەمبارەوبار دەکرد.

پیرەپیاوی خانەخوێ دەست بەچراوە ڤاسیلی ئاندرێڤیچی بەرێ دەکرد تاکوو دالانەکەی بۆ رووناک بکاتەوە، بەلام لرفەی گژەبا خۆی کرد بە دالانەکەدا و چراکەی لێ کوژاندەوە. هەر بە هەوای تووشی نێو حەوشەکەدا دیار بوو کە تۆف و بادەوە توندتری کردووە.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەراستی هەواکەی تووشە! لەوانەیە ئاخری نەگەینە شوێنی مەبەست. بەلام چارەمان نییە، دەبێ ئەو مامەڵەیە تەواو بکەم و ئەو قازانجەم لە کیس نەچێ!» جگە لەوەش خۆی ئامادە کردبوو و خانەخوێ ئەسپەکەی بە کاشەوە حازر و ئامادە لە نێوەراستی حەوشەکە بۆ راگرتبوو. «بە هیوای خودا دەگەینێ!»

پیرەپیاوی خانەخوێ وای بە باش دەزانی بمێننەوە و بەو شەوە سەغڵەتە نەرۆن. ئەو هەوڵی خۆی دابوو کە میوانەکە پێمل بە مانەوە بکات و لە کەری شەیتانی دابەزێنێ، بەلام میوانەکە لە سەر رۆیشتنەکەی سوور بوو، بۆیە ئەویش ئیتر پێداگریی نەدەکرد. لە دڵی خۆیدا گوتی: «رەنگە من بە هۆی پیرییەوە ترسەنۆک بووبێتم و ئەمانە چونکە جوان و جحێڵن ترسیان نییە و دەڕۆن. وا دیارە لە خۆیان رادەبینن و دەزانن توانای ئەو رۆیشتنەیان هەیە. دەیجا دەڕۆن با برۆن، ئاوا لانیکەم ئێمەش لە کاتی خۆیدا دەخەوین و دەردەسەریشمان کەمترە!»

پترووخاش بیری لە خەتەر دەکردەوە، بەڵام چونکە ڕێگاکانی ئەو ناوچەیە بە باشی شارەزا بوو، ورەی وەبەر خۆی دەنا. جگە لەوەش بیری لە شێعرەکەی پاڤلسێن دەکردەوە و شادی و نەشە دڵی دادەگرت: «*بەفر بە دەم بارووشکەوە سەری لە ئاسمان دەسوێ*» چونکە ئەو شێعرە ڕاست نیشاندەری ئێستای زستان و بیابان بوو. لەو ناوەدا تەنیا نیکیتا بوو کە حەزی لە ڕۆیشتن نەبوو، بەڵام ئەو لەمێژ بوو خووی بەوە گرتبوو کە گوێ بە حەز و ئارەزووی خۆی نەدا و پێ بە جەرگی خۆیدا بنێ و گوێڕایەڵی خەڵکی بێ. بەو شێوەیە خۆیان ئامادە کرد و هیچ کەس بۆ ڕۆیشتن بەرگریی لێ نەکردن.

## (٥)

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ که لەو تاریکییەدا کاشەکەی بە باشی نەدەدی خۆی گەیاندە لای و سوار بوو و هەوساری بە دەستەوە گرت.

دەنگی هەڵێنا: «لە پێشمانەوە برۆ!»

پترووخا کە لە نێو کاشە پان و کورتەکەی خۆیدا لە سەر چۆک دانیشتبوو، دەنگی ماینەکەی دا و وەڕێکەوت. ئەسپەکوێت کە لە پێش خۆیەوە بۆنی ماینەکەی هەست پێکردبوو، ماوەیەک بوو دەیحیلاند و چەپۆکانی دەکرد، بە پرتاو بە دوایدا غاریدا و دوو کاشە پێکەوە لە حەوشەکە چوونە دەرێ و دیسان بە کۆلانی گوندەکەدا تێپەڕین و هەر بە ئەو ڕێگایەدا ڕۆیشتن کە پێشتر پێیدا تێپەڕیبوون. بە لای ئەو حەوشەیەدا ڕۆیشتن کە جلەکانی لێ هەڵخرابوو و بەدەم باوە قوڵ و تەشکی خۆیان بە یەکدا دەدا، هەروەها بە لای ئەو ئەمبارەدا تێپەڕین کە بارِن هەتا بنمیچەکەی بەفری تێپەستاوتبوو و سەربانەکەشی ئەژنۆیەک بەفری لە سەر بوو، دوای ئەوە گەیشتنەوە لای ڕیزە داربییەکە کە گڤە و هاژەی با وەقرچەقرچی خستبوون و دەنووشتانەوە و هەڵدەستانەوە. کە گەیشتنە دەشتی باگر، لرفە و هاژەی با لە سەر و خوارەوە تێیان ڕۆدەهات و دەتگوت کەوتوونەتە نێو گێژەنی دەریایەکی بەسام و پڕشەپۆلەوە. بایەکەی هێندە بە قەوەت بوو کاتێک لە لاتەنیشتەوە لێی دەدان خەریک بوو کاشەکە بە لادا بخات و ئەسپەکە لە ڕەوگەی خۆی بەدەر بکات. پترووخا ماینە ڕەسەنەکەی خۆی بە لۆقەیەکی خێرا لێدەخوڕی و بە شادی و نەشەیەکی زۆرەوە دەیقیژاند و ئەسپەکوێت بە دوایدا غاریدەدا.

نزیکەی دە خولەک بەو شێوەیە ڕێگایان بڕی، پترووخا ئاوڕی دایەوە و بە دەنگی بەرز شتێکی گوت. بەڵام بایەکەی هێندە بەقەوەت بوو کە نە ڤاسیلی ئاندرێڤیچ و نە نیکیتا گوێیان لە دەنگی نەبوو. بەڵام تێگەیشتبوون کە گەیشتوونەتە سەری پێچەکە و هەرواش بوو، چونکە پترووخا بە لای ڕاستدا بایدایەوە. بایەکەی دیسان لە لاتەنیشتەوە دەهات و لەگەڵ ئەوەی خەریک بوو کاشەکان هەڵگێڕێتەوە، خۆی بە سینگ و لاجانگیاندا دەدا و لەرزی دەخستە هەناویانەوە. لە لای دەستی ڕاست و لە پشت پەردەی بەفرەکەوە تاپۆیەک ڕەش دەچۆوە. ئەوەش ڕاست دارە کوڵەبنەکەی سەری پێچەکە بوو.

- دەی کەوایە لێرەوە خوداتان لەگەڵ بێ!

- زۆر سپاس، پترووخا. زەحمەتمان دای!

پترووخا دەنگی هەڵێنا و گوتی: «*بادەوە و تۆف و تاریکی سەری گەیشتۆتە فەلەک!*»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ گوتی: «گوێت لێیە نیکیتا، پترووخا شێعر دەخوێنێتەوە!» پاشان قایشی هەوسارەکەی لە پشتی ئەسپەکە دا.

نیکیتا گوتی: «ئەرێ، زۆر کوڕێکی گورجوگۆڵە. مووژیکێکی خانەدانە!»

درێژەیان بە ڕێگاکەیان دا.

نیکیتا کەڵپۆسەکەی لە خۆی پێچا و خۆی کۆم کردەوە و ملی ئەوەندە برد بە ناوەوەدا ڕیشە قوڵەکەی بەرملی داپۆشی، بێدەنگ دانیشت و هەوڵی دەدا ئەو تین و گەرمایەی کە لەماڵی پیرەپیاو بە خواردنەوەی چایی لە ناخیدا کۆی کردبۆوە لە دەستی نەدا. هێڵی ڕاستی ماڵبەنەکەی لە پێش خۆیەوە دەدی و بەردەوام فریوی دەدا، چونکە پێی وا بوو شوێنی

خێشکی کاشەیەکی دیکەیە و هەڵبەز دابەزی کەفەڵی ئەسپەکەی دەدی و کلکی کە بە گرێکەیەوە بۆ لایەک خوار بووبۆوە و لە سەروو ئەویشەوە کەوانی درێژی ماڵبەن و کەڵلەی ئەسپەکەی دەدی کە بە هەموو لایەکدا دەجووڵایەوە و یاڵی بە دەم بایەکەوە شەپۆلی دەدا و هەر تاوێ بە لایەکدا دەکەوت. هێندێ جار کێڵەداری قەراغ ڕێگاکە سەرنجی ڕادەکێشا و دەیزانی کە هێشتا لە سەر ڕێگاکەن و دەبێ لە جێی خۆی نەجووڵێ.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ هەوسارەکەی بە دەستەوە بوو، بەڵام دەستی بۆ شل کردبوو تاکوو ئەسپەکەی بە پێی خۆماکی خۆی ڕێگاکە بدۆزێتەوە و لاڕێ نەبێ. بەڵام ئەسپەکە سەرەڕای ئەو تۆزە وچانەی گوندەکە، زۆر شەکەت و بێهێز دیار بوو، لە ڕووی ناچارییەوە هەنگاوی دەنا و جارجار وێدەچوو بیهەوێ بە لاڕێدا بڕوا، بە جۆرێک کە چەند جار ڤاسیلی ئاندرێڤیچ هێنایەوە سەر ڕاستە ڕێگاکە.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ کێڵەداری قەراغ ڕێگاکەی دەبژارد: «ئەوە یەک، ئەوەش دوو... ئەمەش سێ...» شتێکیش کە لە دوورەوە ڕەشی دەکردەوە، چاوی تێبڕی و لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوەش لێڕەوارەکە لە پێشمانەوە وەدیار کەوت.» بەڵام ئەوەی وەکوو دارستان هاتبووە بەرچاوی تەنیا دەوەنێک بوو. بە لای دەوەنەکەدا تێپەڕین و نزیکەی سەد مەتر چوونە پێشێ بەڵام ئیتر نە کێڵەداری چوارەم دیار بوو نە لێڕەواریش وەبەرچاو دەکەوت. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئیتر دەبێ بگەینە لێڕەوارەکە.» چونکە ڤۆدکا و چایی دیوای دەروونی گەرم داهێنابوو، کەیفساز و بەنەشە ڕێگایەی دەبڕی و دەروەستی نیشانە و کێڵەداری قەراغ ڕێگاکە نەبوو و لەگەڵ لێدانی قایشی هەوسارەکان لە پشتی ئەسپەکە بەتاو لێی دەخوڕی

و ئەسپە خۆشبەز و کەوییەکەش نەرم و لەسەرخۆ، دەڕۆیشتە پێشێ و بەو شوێنەدا کە خاوەنەکەی لێی دەخوری دەڕۆیشت، ئەگەرچی دەیزانی ئەو ڕێگای پێیدا دەڕوا لاڕێیە و نایانگەیێنێتە شوێنی مەبەست. نزیکەی دە خولەکی تر ڕێگایان بڕی و هەروا شوێنەواری لێڕەوار وەبەرچاو نەدەکەت.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ ئەسپەکەی ڕاگرت و گوتی: «وا دیارە دیسان ڕێگاکەم لێ‌تێکچووە!»

نیکیتا بێ‌ئەوەی هیچ بڵێ لە کاشەکە دابەزی و باڵتەکەی کە گژەبا هێندێ جار لە لەشی توند دەکرد و هێندێ جاریش لوی ئاتەگەکانی لێک بڵاو دەکرد و دەیویست لە بەری داکەنێ، بە توندی لە خۆی پێچا و بە هەنگاوی گورج و توندوتۆڵ وەنێو بەفرەکە کەوت و بە هەموو لایەکدا دەڕۆیشت و دەهاتە و دۆزەدۆزەی بوو. سێ جار بە تەواوی لە چاو ون دەبوو و دیسان لەولاوە هەڵتەک هەڵتەک دەهاتەوە و هەوسارەکەی لە دەستی ئاغاکەی وەردەگرت.

بە لەبزێکی توند و لێبڕاوانە گوتی: «دەبێ بە لای ڕاستدا بڕۆین.» پاشان سەری ئەسپەکەی بۆ لای ڕاست سووڕاند.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ هەوساری دایە دەستی نیکیتا و دەستە سڕ و کەسیرە بووەکانی خۆی کرد بە بن باخەڵیدا و گوتی: «باشە، ئەگەر پێت‌وایە دەبێ بە لای ڕاستدا بڕۆین، بڕۆ! ماتڵی چیی؟ لێخوڕە!»

بەڵام نیکیتا گوێی نەدایە و بە ئەسپەکەی گوت: «دەی هاوڕێ، ورەیەک وەبەر خۆت نێ و وەڕێکەوە! بزانم چی دەکەی؟» ئەسپەکە ئەگەرچی تاسمەکان لە پشتی دەدران، بەڵام هیچ گوڕوتینێکی وەبەر خۆی نەدەنا و

هەروا ورد و لەسەرخۆ هەنگاوی دەنا. هەتا ئەژنۆی لە بەفرەکە رۆدەچوو و نارێکوپێک و بە لەقەلەق دەرۆیشت و هەر هەنگاوێکی هەڵدێنایەوە کاشەکەی وەجووڵەجووڵ دەخست.

نیکیتا کە خەرەزەنگەکەی بە پێشی کاشەکەدا هەڵواسیبوو، لێی کردەوە و لە پشتی ئەسپەکەی راکێشا. ئەسپی نەجیم و کەوی کە خووی بە خەرەزەنگ نەگرتبوو، تەکانێکی لە خۆی دا و دەستی کرد بە لۆقە کردن. بەڵام زۆر زوو خاو بۆوە و کەوتەوە سەر رەوتی پێشوو. پێنج خولەک بەو شێوەیە رۆیشتن. وڵات تاریک بوو، بەفر بە دەم گژەباوە شەپۆلی دەدا و لە خوارێ و سەرەوە تێیان دەهاڵا و جاری وا بوو تەنانەت خامووتی ماڵبەندەکە نەدەبیندرا. هێندێ جار پێیان وا بوو کاشەکە راوەستاوە و دەشتەکە بۆ دواوە دەخوشێ. لە ناکاو ئەسپەکە راوەستا. دیار بوو هەستی بە مەترسییەک کردووە لە پێش خۆیەوە. نیکیتا دیسان گورج و چالاک بازیدایە خوارێ و هەوسارەکەی خستە لایەک و چووە پێشێ، تاکوو هۆی راوەستانی کتوپڕی ئەسپەکەی بۆ دەرکەوێ، بەڵام هەرکە هەنگاوێک چووە پێشێ لاقی خزی، تلاربۆوە و هەتا خوارێ بە تلارۆکێ رۆیشت و خۆی بۆ نەگیرسایەوە.

بە خۆی گوت: «هێی ئەوە بۆ کوێ! راوەستە!» تلار دەبۆوە و هەوڵی دەدا خۆی بە شتێکەوە گیر بکات. بەڵام نەیدەتوانی و ئاخری دوای ئەوەی لاقی ئێشی پێگەیشت و بریندار بوو، لە نێو کەوێلکە بەفری نێو شیوەکەدا گیرسایەوە.

ویستی هەستێتەوە، ڕندووە بەفری لێواری کەندەڵانەکە داڕووخا، هاتە خوارێ و هەتا بەر سینگی کەوتە ژێر بەفرەوە و ملیوانەی باڵتەکەی پڕ کرد.

نیکیتا بە تەکانێک خۆی لە بەفرەکە هێنایە دەرێ و قۆپچەی ملیوانەکەی کردەوە، بەفرەکەی داتەکاند و بە کەویلکەی بەفر و شیوەکەی گوت: «ناکەسانە، ئاوا لەگەڵ من هەڵسوکەوت دەکەن؟»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ لە سەرەوە هەرای کرد: «نیکیتا، نیکیت!»

بەڵام نیکیتا گوێی نەدایە و وەڵامیشی نەدایەوە. خۆی تەکاند و کەوتە گەڕان بە دوای خەرەزەنگەکەدا کە کاتی کەوتنە خوارێ لە دەستی پەڕیبوو. کە خەرەزەنگەکەی دۆزییەوە ویستی هەر لەو شوێنەوە بڕواتەوە سەرێ کە کەوتبووە خوارێ، بەڵام هێندە لێژ بوو نەیدەتوانی و بەردەوام دەخزایەوە خوارێ. ناچار بوو هەروا بە نێو شیوەکەدا بڕوا و شوێنێک بدۆزێتەوە کە بتوانێ پێیدا وەسەر کەوێتەوە. شەش حەوت مەتر دوورتر لەو شوێنەی کە کەوتبووە خوارێ بە هەوڵ و چنگەکڕکێ خۆی گەیاندەوە لێواری شیوەکە و ئەو شوێنەی کە پێی وا بوو ئەسپەکەی لێ ڕاوەستاوە. بەڵام کە چووە سەرێ، ئەسپ و کاشە لە هیچ کوێ دیار نەبوون. بەڵام چونکە بە پێچەوانەی بایەکە دەچووە پێشێ، بەر لەوەی چاوی پێیان بکەوێ، گوێی لە دەنگی ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بوو کە بانگی دەکرد و ئەسپەکەشی دەیحیلاند.

گوتی: «ئەوە دێم! ئەوە هاتم! بۆ هاوار دەکەی؟»

کاتێک گەیشتە لای کاشەکە، تازە چاوی بە ئەسپەکە و ڤاسیلی ئاندرێڤیچ کەوت کە لەوێ ڕاوەستابوون و لە بەرچاوی زۆر زەبەلاحیان دەنواند.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بە تووڕەیی گوراندی بە سەریدا: «بە لای ناخێرت لە کوێ بووی؟ ئاوا خۆت ون کرد! دەبێ بگەڕێینەوە! تەنانەت ئەگەر بۆ مۆلچانۆڤکاش بێ!»

ـ ڤاسیلی ئاندرێڤیچ، من لە خودام دەوێ بگەڕێینەوە. بەڵام کوا ڕێگاکە؟ ئەو شیو و دۆڵەی من دیم، کەندەلانێکە بێتوو بکەویە نێوی هاتنەوە دەرێت مەحاڵە. من وەها کەوتمە نێوی کە خۆشم نازانم چۆن هاتمەوە دەرێ!»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ گوتی: «دەی باشە، دەڵێی چبکەین؟ خۆ ناتوانین لێرە بمێنینەوە. دەبێ خۆمان بگەیەنینە شوێنێک.»

نیکیتا وەڵامی نەدایەوە. لە نێو کاشەکەدا پشتی کردە بایەکە و دانیشت، جزمەکانی داکەند و بەفری نێوەکەی داتەکاندن و مشتێکی کلۆش لە ژێر لبادی تەرکی کاشەکە کێشا دەرێ و کردیە نێو جزمەی چەپەیەوە تاکوو کونی تەختی بنەکەی بگرێ.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بێدەنگ بوو. دەتگوت هەموو کارەکانی بە نیکیتا سپاردووە. نیکیتا دیسان چەکمەکەی لە پێ کردەوە و لە نێو کاشەکەدا لاقی لێکبڵاو کرد، هەوساری ئەسپەکەی بە دەستەوە گرت و سەری ئەسپەکەی سووڕاند و بە قەراغی شیوەکەدا وەڕێکەوت. بەڵام هێشتا سەد مەتر نەڕۆیشتبوون کە ئەسپەکە دیسان لە جێی خۆی مێخکوت بوو. شیوێکی تر لە سەر ڕێگاکەیان هەڵکەوتبوو.

نیکیتا دیسان دابەزی و بە نێو بەفرەکەدا کەوتە گەڕان. ماوەیەکی زۆر بە هەموو لایەکدا هەڵسووڕا. ئاخری لە لایەکی دیکەوە، بە پێچەوانەی ئەو شوێنەی کە لێوەی ڕۆیشتبوو، گەڕایەوە.

هەرای کرد: «ڤاسیلی ئاندرێڤیچ، زیندووی؟»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ وەڵامی دایەوە: «ئەرێ، لێرەم. دەی خەبەر چییە؟ ڕێگات دۆزییەوە؟»

ـ هیچ شتێک دیار نییە، تاریکانێکە کەس سەرەندەر ناکا. تەواوی شیو و دۆڵە! دەبێ دیسان بەرەوڕووی بایەکە برۆین.»

دیسان سوار بوونەوە و ڕۆیشتن و هەمیسان نیکیتا بازیدایەوە خوارێ و لە نێو بەفرەکەدا کەوتە گەڕان، دیسان سوار بۆوە و دیسان دابەزییەوە و بەردەوام لە نێو بەفرەکەدا دەگەڕا. ئاخری بە هەناسەبڕکێ و هانکەهانک هاتەوە و لە پەنای کاشەکە ڕاوەستا.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ لێی پرسی: «دەی چیت کرد؟»

ـ هیچ، ئیتر بڕستم لێ بڕاوە. ئەسپەکەش توانای لێبڕاوە و ناتوانێ هەنگاو هەڵێنێتەوە!

ـ ئەی چی بکەین؟

ـ هیچمان لە دەست نایە. ڕاوەستە با بزانم!

نیکیتا دیسان دوور کەوتەوە، بەڵام خێرا گەڕایەوە.

چووە بەردەمی ئەسپەکە و گوتی: «بە دوای مندا وەرە!»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ ئیتر دەستووری نەدەدا، بەڵکوو هەرچی نیکیتا دەیگوت بە قسەی دەکرد و قسەی لە قسەیدا نەدەکرد.

نیکیتا دەنگی هەڵبڕی: «بە دوای مندا وەرە!» بە پڕتاو بۆ لای ڕاست ڕۆیشت و هەوساری ئەسپەکەی گرت و ئەوی بە سەرەولێژیدا بەرەو لای کەویلکە بەفرێک ڕاکێشا.

ئەسپەکە سەرەتا پێی دەچەقاند و نەدەڕۆیشت، بەڵام دواتر تەکانێکی لە خۆی دا و ویستی بە سەر کەویلکە بەفرەکەدا باز بدا. بەڵام نەیتوانی و هەتا بەرملی لە بەفرەکە هەڵچەقی.

نیکیتا گوڕاندی بە سەر ڤاسیلی ئاندریێڤیچدا کە لە نێو کاشەکەدا دانیشتبوو و فەرمانی پێدا: «دابەزە!» خۆشی شانی دایە بەر یەکێک لە ماڵبەنەکان و بەرزی کردەوە تاکوو قورساییەکەی لە سەر ملی ئەسپەکە لاچێ و بە ئەسپەکەی گوت: «کارێکی زۆر دژوارە هاوڕێ. وا نییە؟ بەڵام چارمان نییە! تەکانێکی تر لە خۆت دە! تەنیا تەکانێکی چکۆلە!» ئەسپەکە تەکانێکی لە خۆی دا و دیسان تەکانێکیتر، بەڵام نەیتوانی لە بەفرەکە بێتە دەرێ، زیاتر بە نێویدا ڕۆچوو، دەتگوت لە بیری ئەوەدایە چبکا.

نیکیتا هەروا ئەسپەکەی هان دەدا و دەیگوت: «دەی براکەم، خۆ ئاوا نابێ! دەبێ بێیتەوە دەرێ، دەی تەکانێکی تر لە خۆت دە!»

نیکیتا دیسان شانی دایە بەر ماڵبەنەکە و بەرزی کردەوە. ڤاسیلی ئاندریێڤیچیش شانی دایە بەر ماڵبەنەکەی ئەوبەر و بەرزیان کردەوە. ئەسپەکە سەری ڕاوەشاند و لە ناکاو تەکانێکی لە خۆی دا.

نیکیتا دەنگی هەڵێنا: «یا ئەڵڵا، مەترسە، نوقم نابی! مەترسە!»

ئەسپەکە تەکانێکی توندی لە خۆی دا و دووبارە و سێبارە هەتا ئاخری توانیی لە کۆما بەفرەکە بێتە دەرێ، دوای ئەوەی هاتە دەرێ ڕاوەستا و دەستی کرد بە هەناسەبڕکێ و خۆی ڕاوەشاند تاکوو بەفرەکە

لە خۆی بتەکێنێ. نیکیتا پاڵی بە کاشەکەوە دەنا و دەیویست لە بەفرەکەی دەرهێنێتەوە، بەڵام ڤاسیلی ئاندرێڤیچ هێندە ماندوو بووبوو و بەو دوو باڵتە کەڵپۆسەوە کەوتبووە هانکەهانک و هەناسەبڕکێ تەنانەت نەیدەتوانی هەنگاوێک هەڵێنێتەوە. بە شلوشەویقی تەکانێکی لە خۆی دا و لە نێو کاشەکەدا خۆی مەلاس دا.

ئەو شاڵەی کە لە گوندەکە لە ملی هاڵاندبوو کردەیەوە و گوتی: «با تۆزێ پشوو بدەم، خۆ مردم.»

نیکیتا گوتی: «باشە، تۆ هەر لەوێ وەرکەوە، قەیناکا. تۆ پشوو بدە، من کاشەکە لێدەخورم.» هەوساری ئەسپەکەی گرت و کاشەکەی نزیکەی دە هەنگاو بردە خوارێ و پاشان هێندێک سەرەوژوور هەڵکشا و لەوێ ڕاوەستا.

شوێنێک کە نیکیتا لێی ڕاوەستابوو، نێو شیو و دۆڵ نەبوو کە بارن بکات و وەژێر بەفر بکەون، بەڵکوو لە خوارووی شیوەکەوە هەڵکەوتبوو و تا ڕادەیەک جێگاکەیان پەنابا بوو. چەند خولەکێک بوو دەتگوت بایەکەی خستووە و وەک پێشوو گڤە و هاژەی نەدەهات. بەڵام ئەو ئارام بوونەوەیەی زۆری نەدەخایاند و زریان و بادەوە، وەک ئەوەی بیهەوێ تۆڵە بکاتەوە، زۆر توند و بەقەوەت هەڵیدەکرد و بەفرەکەی بە ڕقێکی ئەستوور و شەیتانییەوە ڕادەماڵی و گێژی دەدا. یەکێک لەو گەردەلوول و بادەوە و باسریشکانە کاتێک هەڵیکرد کە ڤاسیلی ئاندرێڤیچ دوای ماوەیەک پشوودان لە کاشەکە دابەزیبوو تاکوو لەگەڵ نیکیتا قسە بکا و لێی بپرسێ چبکەن. هەردووکیان بە ناچاری خۆیان کوشمەڵە کرد تاکوو تەوژمی گژەبا و بادەوە هێور بێتەوە. ئەسپەکەش دیار بوو دڵگرانە و

تۆفوبەند ترسی خستۆتە دڵیەوە، گوێچکەی داتەپاندبوو و سەری ڕادەوەشاند. کاتێک لرفە و هاژەی بادەوە تۆزێ نیشتەوە، نیکیتا دەستکێشەکانی داکەند کردی بە ژێر پشتێنەکەیدا و تۆزێ هووی لە دەستی کرد، پاشان دەستی کرد بە کردنەوەی تاسمەی خامووتەکان.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ لێی پرسی: «ئەوە چی دەکەی؟»

نیکیتا بە لەبزێک کە دەتگوت داوای لێبوردن دەکا گوتی: «خەریکم ئەسپەکە دەکەمەوە. ئیتر هیچمان پێ ناکرێ! خۆ توانامان نەماوە و برستمان لێ براوە.»

- یانی ئیتر ناتوانین خۆمان بگەیەنینە شوێنێک؟

نیکیتا ئەسپەکەی پیشان دا، کە سەری دانەواندبوو و کەوی و گوێلەمست بەرەوڕوویان ڕاوەستابوو و ئامادەی هەر کارێک بوو کە لێی بخوازن. خاڵیگە بە عارەقە خووساوەکانی بە توندی هەڵدەستان و دەنیشتنەوە، گوتی: «نا، ناتوانین. تەنیا خەریکین ئەو ئاژەڵە بەستەزمانە سەقەت دەکەین. بێچارە خەریکە دەپسێ! دەبێ هەتا بەیانی لێرە بمێنینەوە.» وەک ئەوەی گەیشتبێتە کاروانسەرایەک و بیانهەوێ ئەسپەکە لە کاشە بکەنەوە بۆ ئەوەی دایکەنە نێو گەوڕەوە، هەوسار و لەغاوەکەی لە مل و دەمی داماڵی.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ گوتی: «شەوێ لێرە قڕمان نایە؟»

- ڕەنگە قڕیشمان بێ. بەڵام هیچ چارەیەکمان نییە. ئەگەر کارێکی لەوە باشترت پێ شک دێ فەرموو!»

## (٦)

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بە دوو باڵتەی کەڵپۆسەوە بەتایبەت دوای هەوڵدانێکی زۆر لە نێو کۆما بەفرەکەدا گەرمی بۆوە، بەڵام چونکە بۆی دەرکەوت دەبێ بەڕاستی شەوێ لە نێو ئەو بەفرەدا بمێنێتەوە، هەستی کرد تەوژمی سەرمایەک لە مۆغەرەی پشتی گەڕاوە. لە نێو کاشەکەدا دانیشت و جگەرە و شقارتەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و خۆی پێوە سەرقاڵ کرد تاکوو تۆزێ ئۆقرە بگرێ.

نیکیتا لەو کاتەدا ئەسپەکەی ئازاد کرد و تەنگە و کەژووی لێ داماڵی و تاسمەی زینەکەی لە پشتی کردەوە، هەموو یەرەق و شتەکانی لێ جیا کردەوە و لە تەواوی ئەو ماوەیەدا بەردەوام قسەی لەگەڵ دەکرد و دڵخۆشیی دەدایەوە و ورەی وەبەر دەنا.

ئەسپەکەی لە نێوانیماڵبەنەکە هێنایە دەرێ و گوتی: «زۆر چاکە وەرە دەرێ، وەرە دەرێ، لێرە دەتبەستمەوە. کات بۆ دەکەمە خۆرجینەکەوە و هەوسارەکەت لە سەر دادەماڵم. شتێک بخۆی تۆزێ تینت وەبەر دێتەوە!» ئەو قسانەی دەکرد و ئەوەی دەیگوت دەیکرد.

بەڵام دیار بوو بە قسەکانی نیکیتا ئاسوودە نابێ و ئارام نەدەبۆوە و ئەمپا و ئەوپای دەکرد و سمی لە بەفرەکە دەکوتا. پشتی لە بایەکە دەکرد و خۆی بە کاشەکەوە دەنووساند و سەری لە قۆڵی نیکیتا هەڵدەساوی.

دەتگوت قەستی تەنیا ئەوەیە دەستی نیکیتا نەگیرێتەوە و ئەو ئالفەی لە بەردەمیدا گرتوویەتی بە ئیشتیاوە دەمی بۆ بەرێ، بۆیە قەپالێکی

لیدا، بەڵام دواتر دەتگوت دەزانێ ئێستا کاتی لەوەڕ نییە و کارێکی پێویستتریان لە پێشە، بۆیە دەمی شل کرد و ئالفەکە با بردی و بە سەر ڕووبەری بەفرەکەدا بڵاوی کردەوە.

نیکیتا گوتی: «ئێستا دەبێ نیشانەیەک بچەقێنین.» لای پێشەوەی کاشەکەی بەرەوڕووی با بەرز کردەوە و ماڵبەنەکانی بە قایشی زینەکە پێکەوە بەست، بەرزی کردەوە و پاڵی بە بەشی لای پێشەوەی کاشەکەوە دا و گوتی: «ئێستا ئیتر ئەگەر بەفر و بارن دامانپۆشێ خەڵکی نیشانەکەمان دەبینن و لە ژێر بەفرەکە دەرمان دەهێننەوە!» دەستکێشەکانی پێکدادا و دیسان لە دەستی کردنەوە. «ئەمە کارێکە کە پێشینانمان گوتوویانە حەتمەن دەبێ بیکەین.»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ قۆپچەی باڵتەکەی کردەوە و هەڵیکێشا تاکوو سەری داپۆشێ و هەناسەی بچێتەوە نێو سینگ و بەرۆکی و کزەبا بەفرەکە نەدا بە سەروگوێلاکیدا. لقە شەمچەکانی لە دوای یەک بە قوتووە پۆلایینەکەیدا دەهێنا. بەڵام دەستی دەلەرزی و لقە شەمچەکان بەر لەوەی هەڵبن، دەکووژانەوە یان کاتێک هەڵیش‌دەبوون بەر لەوەی بگاتە جگەرەکەی، بایەکە دەیکووژاندەوە. ئاخری لقێک گرتی و بۆ ساتێک تیسکی ملیوانەی باڵتەکەی و دەستی و ئەنگوستیلە ئاڵتوونەکەی کە لە قامکی زەرنەقووتەیدا بوو و کا و ئالفی وەدەرکەوتوو لە ژێر بەڕەکە و بەفری بەردەمی ڕووناک کردەوە و جگەرەکەی داگیرسا. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ تامەزرۆیانە دوو مژی قووڵی لێدا و دووکەڵەکەی هەڵمژی بۆ نێو سییەکانی. ویستی مژی سێهەمی لێدا بەڵام چونکە لە سەرمانا لێوی دەلەرزی، شالاوی گژەبایەکە

سیگارەکەی لە لێوی ڕفاند و بردی بۆ ئەو شوێنەی کە کا و ئالفەکەی دەبرد.

بە لەبزێکی لێبڕاوانەوە گوتی: «دەی، وا دیارە دەبێ ئەمشەو لێرە بمێنینەوە! چارمان نییە، جگە لەوە چیمان لە دەست دێ؟ کەوایە با بخەوین! ڕاوەستە، دەبێ ئالایەک بۆ نیشانە بچەقێنین.» ئەو شاڵەی کە لە ملی کردبۆوە و خستبوویە نێو کاشەکەوە هەڵیگرت، دەستکێشەکانی داکەند و لە سەر بەشی پێشەوەی کاشەکە ڕاوەستا، لە سەر نووکی لاقی خۆی بەرز کردەوە تاکوو دەستی بگاتە قایشی زینەکە و شاڵەکەی توند لە سەری ماڵبەنەکە گرێدا، دوای ئەوەی بەستی، شاڵەکە خێرا دەستی کرد بە شەکەشەک و شێتانە شەقەی دەهات و بە دەم بایەکەوە سەمای دەکرد هێندێ جار خۆی بە ماڵبەنەکەوە دەنووساند و هێندێ جاریش خۆی دەدایە دەست گژەباکە و وەک بایەوان دەشەکایەوە.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ کارەکەی خوی پەسند کرد و گوتی: «بڕوانە چەندە باش دەرهات! زۆر چاکە، ئێستا ئەگەر لە پەنای یەک دانیشتبایەین گەرمتر دەبووینەوە، بەڵام خۆ جێگا نییە.»

نیکیتا گوتی: «تۆ خەمی منت نەبێ! من جێگایەک بۆ خۆم دەدۆزمەوە. سەرەتا دەبێ ئەسپەکە داپۆشم. بەستەزمانە هەموو گیانی لە ئارەقەدا خووساوە. ڕاوەستە بزانم.» هات بۆ لای کاشەکە و گوتی: «ئەوە بدە بە من!» سووچی بەڕەکەی گرت ولە ژێر پێی ئاغاکەی دەرکێشا.

دووقەدی کرد دوای ئەوەی لەغاوەکەی لە دەمی ئەسپەکە دەرهێنا و زینەکەی لە پشتی کردەوە، بەڕەکەی دا بە پشتیدا زینەکەی لە سەر

پشتی دانایەوە و توند بەستی و دیسان لەغاوەکەی لە دەمی کردەوە و گوتی: «فەرموو سەرزل، ئەمجار ئیتر سەرمات نابێ!» نیکیتا دوای ئەوە دیسان هاتەوە بۆ لای کاشەکە و گوتی: «خۆ تۆ پێویستت بە لبادەکە نییە، لەگەڵ تۆزێ کا بیدە بە من!»

لبادەکە و باوەشێک کولۆشی لە ژێر ڤاسیلی ئاندرێڤیچ دەرکێشا و چووە پشت کاشەکە، لە نێو بەفرەکەدا قووڵکێکی هەڵکەند و کایەکەی تێدا ڕاخست، کڵاوەکەی تەواو داکێشا و هەتا بەرچاوی داپۆشی، باڵتەکەی توند لە خۆی پێچا و لبادەکەی بە سەر خۆیدا دا، لە سەر کایەکە دانیشت و پاڵی بە پشتی دارینەی کاشەکەوە دا، بەو شێوەیە لە باوەشی بەفر و گژەبادا ئۆقرەی گرت.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بە چاوێکی سووک و توانجئامێزەوە دەیڕوانییە ئەو کارانەی نیکیتا و سەری ڕادەوەشاند. لە سەریەک بە چاوی سووک لە کرێکار و وەرزێڕەکانی دەڕوانی و ئەو نەخوێندەوارانەی بە گەوج و بێشعوور دەزانی. ئاخری خۆی مەلاس دا و بۆ خەوتن خۆی ئامادە کرد. ئەو کا و کلۆشەی لە تەرکی کاشەکەدا مابوو تەختی کرد و لەگەڵ ئەوەی زۆرتری کلۆشەکەی خستە ژێر پشت و کورتە کەلەکەی، دەستکێشەکانی لە دەستی کرد و جێگای سەری لە سووچی کاشەکە و شوێنێک کە پەنابا بوو، توند کرد و جووڵەی لە خۆی بڕی.

بەڵام خەوی نەدەهات، خۆی ڕاکێشابوو و بیری دەکردەوە و بیر و خەیاڵی تەنیا لە دەوری شتێک دەسووڕایەوە کە تاقە ئامانج و مانای ژیان و تەنیا هەوێنی دڵخۆشی و غورووری بوو، ئەویش ئەمە

بوو کە تا ئێستا چەندەی ماڵ و سامان پێکەوە ناوە و لە داهاتووشدا دەتوانێ چەندەی دیکە بەدەست بێنێ، خزم و ئاشناکانی چەندەیان پارە و سامان پێکەوە ناوە و پێکەوەی دەنێن و ئەویش نابێ لەوان بمێنێتەوە و دەبێ لەوان زیاتر بەدەست بێنێ و وەپێشیشیان بکەوێ.

کڕینی دارستانی گۆریاشکینۆ بۆ ئەو زۆر گرینگ و بەنرخ بوو. هیوادار بوو بەو مامەڵەیە بە جارێک دە هەزار ڕۆبڵ قازانج بکات، دەستی کرد بە حیساب کردنی نرخی دارستانەکە کە پایزی ڕابردوو هاتبوو و دارەکانی دوو دسیاتینی یەک بە یەک ژماردبوو، لە زەینی خۆیدا لێکی دەدایەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: «داربەڕووەکان بۆ خێشکی کاشە دەنالێ! هەڵبەت بۆ دەستەک و ئالوداری خانووبەرەش زۆر باش و بەکەڵکە. لە هەر دسیاتینێک بە ڕادەی سی ساژێن ئێزنگم بۆ دەمێنێتەوە. یانی هەر دسیاتینەی دووسەد و بیست و پێنج ڕۆبڵم قازانج پێدەگەیێنێ. دارستانەکە لە سەر یەک پەنجا و شەش دسیاتینە، یانی دەبێتە پەنجا و شەش دانە سەد ڕۆبڵی و پەنجا و شەش دانە سەد ڕۆبڵی و پەنجا و شەش دانە دە ڕۆبڵی و پەنجا و شەش دانە دە ڕۆبڵی و پەنجا و شەش دانە پێنج ڕۆبڵی.»[١٤] هەروەها حیسابی کرد کە نرخی فرۆشتنی داری لێرەوارەکە لە دوازدە هەزار ڕۆبڵی تێدەپەڕێنێ. بەڵام بەبێ چۆرتکە نەیدەتوانی حیسابی بکا کە بڕی پارەکە دەبێتە چەند ڕۆبڵ. «بەڵام هەرچۆنێک بێ، ئەو دەهەزار ڕۆبڵەی داوای کردووە نایدەمێ. لانی زۆر هەشت هەزار ڕۆبڵی

---

14 ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بە شێوەی چۆرتکە ژمارەکانی پێکەوە کۆ دەکردەوە.

دەدەمێ، چونکە نابێ ڕووتەنەکانی[15] حیساب بکات. سمێڵچەورانەیەک دەدەم بە پێوەرەکە و سەد یان سەد و پەنجا ڕۆبڵ دەنێمە گیرفانی، تاکوو ڕووتەنەکان پێنج دسیاتین حیساب بکات و دارستانەکە بە هەشت هەزار ڕۆبڵ دەکڕم. سێ‌هەزار ڕۆبڵی پارەی نەغد دەدەمێ، ئەوی دیکەشی دەکەمە قەرز. ئەگەر چاوی بە پارە بکەوێ نەرم دەبێ و زمانی ناگەڕێ!» کە گەیشتە ئێرە، دەستێکی بە جزدانەکەی باخەڵیدا هێنا. «تەنیا خودا دەزانێ چۆن سەرمان لێشێوا و ئاوامان بەسەر هات، ئەگەر ڕێگاکەمان لێ نەشێوایە ئێستا گەیشتبووینە لێرەوارەکە و لای ژووری مێشەڤاکە و دەنگی وەڕینی سەگەکانمان دەبیست. بەلام ئەو دوابڕاوانە کاتێک وەڕینەکەیان کەڵکی هەبێ دەمیان ڕەق دەبێ و نووزەیان دەرنایە.» ملیوانەی باڵتەکەی لە بەر گوێچکەی لابرد و گوێی شل کرد. بەلام جگە لە گڤەی با و شەکەشەکی شاڵەکە و ترپەی کلووی بەفر کە با بە کاشەکەیدا دەکێشا، هیچ دەنگێکی‌تر نەدەهات. دیسان ملیوانەی باڵتەکەی هەڵکێشایەوە و سەر و گوێچکەی داپۆشی.

«ئەگەر بمزانیبایە ئاوای لێ‌دێ، شەوێ لەوێ دەمامەوە! بەلام خۆ جیاوازیی نییە، خۆ ئەمشەو نەگەیشتینێ، سبەینێ هەر دەگەینێ. تەنیا ڕۆژێکمان لە کیس چوو. بەو هەوا تووش و تۆفوبەندە خەڵکی شاریش لە ماڵ نایەنە دەرێ و ناگەنە ئێرە مامەڵەکەم لە چنگ دەرهێنن.» وەبیری هاتەوە کە ڕۆژی نۆیەم کاتی وەرگرتنی

---

15 ڕووتەن: بەشێک لە دارستان کە داری لێ شین نەبووە یان بڕیویانە.

قەرزەکەی لە کابرای قەسابە کە مەڕ و کاوڕی پێ فرۆشتبوو. «دەیویست خۆی پارەکە بێنێ. ئێستا کە خۆم لە ماڵەوە نیم خۆ ژنەکەم نازانێ حیسابەکە چەندەیە و پارەکەی لێ وەرگرێ. ژنەکەم زۆر نەزان و نەخوێندەوارە، نازانێ چۆن لەگەڵ خەڵکی هەڵسوکەوت بکات.» وەبیریشی هاتەوە کە ڕۆژی ڕابردوو ژنەکەی نەیتوانیبوو لەگەڵ سەرۆکی پۆلیسی ناوچەکە قسە بکات کە بە میوانی هاتبووە ماڵەکەیان. «دەی ژنە ئیترا خۆ لە هیچ کوێ ئەو شتانەی نەدیوە تاکوو فێر بێ و ڕووی بکرێتەوە!» سەردەمی باوکم مەگین ماڵەکەی خۆمان چۆن بوو؟ ماڵی مووژیکێک بوو کە بتسووتاندبایە بۆسۆی لێ هەڵنەدەستا و شەڕەکەلی تێدا بکرایە زەرەدی پووشێکمان لێ نەدەکەوت. دار و نەدارمان ئەمبارێک و مسافیرخانەیەک بوو، هەر ئەوە و بەس. من لە ماوەی پازدە ساڵدا گەیشتمە ئێرە و ئەو ماڵ و سامانەم پێکەوە نا. دووکانم هەیە، دوو قاوەخانە و ئاشێکی گەورە و سایلۆیەک و دوو پەڵە زەوی کە داومە بە ئیجارە. ماڵی خۆم هەیە بە ئەمباری گەورەوە!» ماڵ و سامانەکەی لێکدەدایەوە و شانازیی بە خۆیەوە دەکرد. «ئەوانە هیچی پێوەندیی بەو میراتەوە نییە کە لە باوکم بۆم مابێتەوە. ئەمڕۆ لە تەواوی ناوچەکەدا لە من دەوڵەمەند و ناوبەدەرەوەتر کەس نییە، بێرخوونۆڤ! جا ئەوەش لە خۆڕا نییە، من مێشکم کار دەکا و تێدەگەم و دەزانم چبکەم! کار دەکەم بەڵام نەک وەکوو خەڵکی، من نە تەمبەڵ و تەوەزەلم و نە وەک ئەو گوندنیشنانەش مێشکبۆش و بێشعوورم. من شەوانەش داناکەوم و هەڵدەسووڕێم. هەوا خۆش بێ و تۆفوبەند و ڕەشەبا بێ گوێم لێ

نییە و بە دوای کاردا دەڕۆم. پیاو ئەگەر ئاوا بێ هەمیشە کاری بە دەستەوە دێ و سەرکەوتوو دەبێ. خەڵکی پێیان وایە کاری پارە پەیدا کردن هەروا گاڵتەیە، دەبێ بزانی تووەکەی داچێنی و وەک گیا شین بێ! بۆ پارە پەیدا کردن تەنیا ئارەق ڕشتن و خۆماندوو کردن شەرت نییە، دەبێ مێشکیشت وەکار خەی. شەوێ لەو سەحرایە ڕۆژ دەکەمەوە و ناخەوم، خۆ لێم کەم نابێتەوە.» لووت بەرزانە بە خۆی گوت: «هێندە بیر دەکەمەوە دەڵێی بالیفێکی پڕ لە فکرە لە نێو سەرمدا تل دەخوا، نەک سەری من لە سەر بالیفی نەرمونیان بێ! خەڵکی پێیان وایە پیاو بە بەخت و ناوچاو دەبێتە ماڵ و کەسایەتی وەدەست دێنی! وەک میروونۆڤ. ئێستا بۆتە ملیۆنێر، بۆ؟ چونکە لە قەدیمەوە گوتوویانە دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە! تەنیا خودا ڕەحمی بکردایە و ئەمشەو لەو تەنگانەیە ڕزگارمان بوایە!»

بیری ئەوەی کە ئەویش لەوانەیە وەک میروونۆڤ کە بەوپەڕی دەستەنگییەوە دەستی پێکردبوو و ئێستا یەکێک لە ساماندارەکانی ناوچە بوو، ئەمیش لە داهاتوویەکی نزیکدا ڕەنگە ببێتە ملیۆنێر، هێندەی تووشی هەیەجان کردبوو کە هەستی کرد پێویستی بە کەسێکە قسەی لەگەڵ بکات. بەلام بە داخەوە کەسێ نەبوو کە دەردەدڵی لەگەڵ بکات و لەگەڵی باخێوێ. ئەگەر بیتوانیبایە خۆی بگەیێنێتە گۆریاشکینۆ، لەگەڵ ئاغای ئەوێ قسەی دەکرد و بۆی باس دەکرد کە کێیە و چیی کردووە.

لەگەڵ ئەوەی گوێی لە گڤە و هاژەی با بوو کە وەک قامچی بە پێشەوەی کاشەکەدا دەکێشرا و خواری دەکردەوە و کلووی بەفری

دەهێنا و بە کاشەکەیدا دەدا، لە بەرخۆیەوە گوتی: «پەککو لەو گژەبایە! لەوانەیە وا بکەوینە ژێر بەفرەوە کە بەیانی بە هیچ جۆرێک نەتوانن دەرمانهێننەوە.» ڕاستەوە بوو و چاوی لە دەوروبەر کرد. لە نێو گێژ و خولی بەفر و بادەوە و تاریکیدا سەری ئەسپەکە و پشتی کە ڕەشتر لە دەوروبەر بوو، هەروەها بەڕەکەی سەرپشتی کە بە دەم باوە دەجوولا و کلکە بژەکەی بە گرێکەیەوە بە دەست باوە ڕادەوەشا، کەوتە بەرچاوی و جگە لەوەش هەموو دەوروبەر لە گشت لایەکەوە لە پاش و لە پێشەوە هەموو جێیەک بە شێوەیەکی یەکشکڵ و یەکهاوی خۆی دەنواند و شەوەزەنگ و ڕەشەبا و بادەوە بە سەر هەموو دەشتەکەدا زاڵ بوو، تاریکییەکە هێندێ جار کەمتر دەبۆوە و هێندێ جاریش دەبووە بڵقەتاف و ئەنگوستەچاوێک چاو چاوی نەدەدی.

دیسان بە خۆی گوت: «چ هەڵەیەکم کرد کە ئەقڵی خۆم دایە دەست نیکیتا. دەبوو ڕانەوەستین و درێژەمان بە ڕێگا بدایە. ئاخری دەگەیشتینە شوێنێک. تەنانەت دەمانتوانی بگەڕێینەوە بۆ مۆلچانۆڤکا و لە ماڵی تاراس بخەوین. نا، ئاوا ناچارین هەتا بەیانی لەوبەر سەرما و تۆفوبەندە هەڵلەرزین. بەڵام من ئێستا لە بیری چیدا بووم کە گەیشتمە ئێرە؟ بەڵێ، دەمگوت خودا بەرەکەت بە سەر مرۆڤە ئازا و بەکارەکاندا دەڕێژێ، نەک تەمبەڵ و قوونگران و مێشکبۆشەکان! چۆنە جگەرەیەک داگیرسێنم.» دانیشت و قوتووی جگەرەکەی دەرهێنا، خۆی دانەواند و بە ئاتەگەکەی پەنابایەکی بۆ جگەرەکە ساز کرد، هەنیشکی نایە سەر تەرکی بە کا داپۆشراوی کاشەکە، بەڵام بایەکە هەر جارەی لە کەلێنێکەوە هۆمەنی بۆ ئاورەکە دێنا و لقە شەمچەکەی

دەکوژاندەوە. ئاخری ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بە هەر فێڵ و تەگبیرێک بوو توانیی بە سەر بایەکەدا زاڵ بێ و جگەرەکەی داگیرساند. لەوەی کە توانیبووی ئەو کارەی حەزی لێی بووە بیکات، کردوویەتی کەیفی ساز بوو، ئەگەرچی دووکەڵی جگەرەکە زیاتر بە بایەکە دەبرا و ئەو نەیدەتوانی لە سێ مژ زیاتری لێ بدا. بەڵام تا رادەیەک هاتەوە سەرخۆ و ئۆخژنێک گیانی داگرت. جارێکی تر خۆی بە پشتدا خستەوە و پاڵی بە لای پێشەوەی کاشەکەوە دا و باڵتەکەی توند لە خۆی پێچا، دوای تۆزێ خۆمات کردن دیسان کەوتەوە سەر رێچکەی بیرەوەرییەکانی و کەوتە گەران بە رابردووی خۆیدا و هەروەها خەیاڵپلاو و پیلان و بەرنامە بۆ داهاتووی. بەڵام لە ناکاو بێئەوەی خۆی بیهەوێ چاوەی زانیارییەکانی تاریک داگەرا و خەوی لێکەوت.

دوای ماوەیەک لە ناکاو وەک ئەوەی شتێک دایچڵەکاندبێ، لە خەو راچەنی. جا نەیدەزانی ئەسپەکە بە ددان کلۆشی ژێری دەرکێشابوو یان شتێکی تر لە ناخیدا جووڵاندبووی. بەڵام ئێستا کە لە خەو راپەرییبوو دڵی هێندە بە پرتاو لێیدەدا کە پێیوابوو کاشەکە لە ژێریدا ترپەی دێ. چاوی هەڵێنا. دەوروبەری هەروەک خۆی وا بوو و گۆرانی بە سەردا نەهاتبوو. تەنیا سەحراکە تۆزێ رووناکتری دەنواند. پێیوابوو خەریکە رۆژ دەبێتەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «هەوا خەریکە رووناک دەبێتەوە، وا دیارە هێندەی نەماوە رۆژ بێتەوە.» بەڵام خێرا وەبیری هاتەوە کە ئەم رووناکییە تریفەی مانگە، هەستا و دانیشت، سەرەتا چاوێکی لە ئەسپەکە کرد. بەستەزمانە هەروا پشتی لە بایەکە کردبوو و بە پێوە لە بەر تەوژم و تۆفی سەرما دەلەرزی. لۆیەکی

بەرەکە کە نیکیتا دابووی بە سەر پشتی ئەسپەکەدا بەفر داپۆشیبوو و بایەکە هەڵگێڕابۆوە و لەغاوەکە لە دەمی داماڵدرابوو. سەری ئەسپەکە کە بەفر داپۆشیبوو لەگەڵ چەتری یاڵوبژی کە بە دەم باوە دەجووڵا، جوانتر دیار بوو. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ دانەوی و چاوی لە پشتی لای پێشەوەی کاشەکە کرد. نیکیتا هەروەک پێشوو خۆی کوشمەڵە کردبوو و لە حەوساڵان ڕاست بووبۆوە. لاقوقولی و لبادەکەی کە تێی پێچابوو هەموو کەوتبووە ژێر بەفرەوە. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ بە خۆی گوت: «ئەو چارەڕەشە سەرما دەیبا! بێچارە جلکێکی ئەوتۆشی لە بەردا نییە. هەر ئەوەی ماوە خوێنی ئەوەشم بێتە مل. ئاخ لە دەستی ئەو گوندنشینە گەمژە و بێشعوورانە! بەڕاستی نەخوێندەواری بەڵایەکی گەورەیە!» ڤاسیلی ئاندرێڤیچ ئەوەی گوت دەیویست بەرەکە لە ئەسپەکە بکاتەوە و لە نیکیتای بپێچێ. بەڵام بەو سەرمایە هەستان لە جێگای خۆی و گەڕان بەملا و ئەولادا زۆر دژوار و ناخۆش بوو، جگە لەوەش دەترسا ئەسپەکە لە سەرمانا بتۆپێ. «هەر نازانم من بۆ ئەوەم لەگەڵ خۆم هێنا؟» ژنەکەی خۆی وەبیر هاتەوە کە ئیتر دڵی پێی نەدەکرایەوە و لە بەرچاوی کەوتبوو، گوتی: «هەمووی خەتای ئەو ژنە بێشعوورە بوو!» دیسان لە شوێنەکەی خۆی پاڵیدایەوە و خاڵی وەبیر هاتەوە کە شەوێک ئاوا لە بەفر و سەرمادا مابۆوە و هیچ بەڵایەکی بە سەر نەهاتبوو. بەڵام هەر خێراش ڕووداوێکی تری وەبیر هاتەوە و گوتی: «بەڵام سواستیانیشی لەگەڵدا بوو کە بەیانی لە ژێر بەفریان دەرکێشا ڕەق هەڵاتبوو. سەرما بردبووی! ئەگەری شەوێ لە مۆلچانۆڤکا بمابایەینەوە تووشی ئەو چەرمەسەری و مەترسییە نەدەبووین.»

باڵتەکەی توندوتۆڵ لە خۆی پێچا تاکوو گەرمای باڵتە کەڵپۆسەکە بە هیچ جۆرێک بە هەدەر نەچێ و هەموو ئەندامەکانی لەشی، مل و لاق و ئەژنۆی گەرم دابێنێ. چاوی قووچاند و بە هیوا بوو دیسان خەوی لێبکەوێتەوە، بەڵام هەرچی هەوڵی دا ئیتر نەیتوانی خۆی لە بیر بەرێتەوە و بە پێچەوانە هەستی دەکرد بە تەواوی شاد و بەنەشەیە. دیسان دەستی کرد بە حیساب کردنی قەرزەکانی کە لە لای خەڵک بوو و دڵخۆش و شایی بەخۆ بسکەی سمێڵی دەهات و بە خۆیدا هەڵدەگوت، بەڵام ترس و داخی ئەوەی کە بۆچی شەوێ لە مۆلچانۆڤکا نەماوەتەوە و ئەم ڕێگا پڕ مەترسییەی گرتوتە بەر، بەردەوام هەودای خەیاڵی دەپساند و بە دزییەوە خۆی بە دڵ و مێشکیدا دەکرد. «ئەگەر لەوێ بمابایەتمەوە ئێستا لە ژوورێکی گەرمدا لە سەر دۆشەک و چرپا خەوتبووم. ئیتر خۆم تووشی ئەم ڕەشەبا و تۆف و سەرمایە نەدەکرد!» چەند جار خۆی جووڵاند و باڵتەکەی لە خۆی پێچا، هەوڵی دەدا بکەوێتە دۆخێکی ئاسوودەوە و زیاتر خۆی لە لرفە و کزەی بایەکە بپارێزێ. بەڵام هەر کارێکی کرد ئەو ئاسوودەیی و ئۆقرەیەی دەیویست بۆی دەستەبەر نەکرا. دیسان هەستا و بارەکەی خۆی گۆڕی، شاقەلی باڵتەکەی لە لاقوقولی پێچایەوە و چاوی قونجاند و جووڵەی لە خۆی بڕی. بەڵام لاقی لە نێو چەکمە قورس و لبادییەکاندا گوشاری بۆ هاتبوو و ژانی دەکرد یان بایەکە لە کەلێنێکەوە ڕەخنەی دەکرد و خۆی دەخزاندە ژێر جلەکانییەوە، بۆیە ئۆقرەی لێ دەبڕا و نەیدەتوانی لە سەر بارێک بحەجمێ. دوای تاوێک خۆ مات کردن و چاو نووقاندن ماڵە گەرمەکەی کابرای وەرزێری وەبیر هاتەوە و ئەوەی کە

ئەگەر لەوێ بمایەتەوە ئێستا بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە خەوتبوو؛ تا دەهات چاوی بچێتە خەو دادەچڵەکی و خەفەتێک تەنگی بە ڕۆحی هەڵدەچنی، بۆیە لە داخانا هەڵدەستا و دوای ئەوەی لەعنەتی لە خۆی دەکرد جینگڵێکی لە خۆی دەدا و گەرمتر خۆی دادەپێچا و دیسان خۆی مات دەکردەوە.

جارێک پێی وابوو لە دوورەوە دەنگی کەڵەشێر دەبیستێ. دڵی خۆش بوو. ملیوانەی باڵتەکەی لە سەر گوێچکەی لابرد تاکوو باشتری گوێ لێبێ و گوێی شل کرد بەڵام هەرچی هەناسەی ڕاگرت و گوێی ڕاگرت جگە لە لوورە و هاژەی با و جیرەی ماڵبەنەکە و شەکەشەکی شاڵەکە و ترپەی کلووە بەفرەکان کە لە کاشەکان دەدران هیچی تری نەبیست.

نیکیتا هەروا کە خەوتبوو لە سەر بارێک جووڵەی نەکردبوو، چەند جاریش کە ڤاسیلی ئاندرێڤیچ هەرای لێکردبوو وەڵامی نەدابۆوە. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ چەند جار چاوی لە پشت کاشەکە کرد و نیکیتای دی کە گەردالە بەفرێکی ئەستووری لێ نیشتبوو و بە دڵێکی پڕ ئێرەییەوە گوتی: «مێشینکیشی میوان نییە. نێرەکەر هەر گوێشی لێ نییە و دەڵێی لە بەر تینی سۆبا خەوتووە. دەبێ خەوی لێکەوتبێ!»

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ نزیکەی بیست جار هەستا و خەوتەوە. هەستی دەکرد شەو کۆتاییی نایە. جارێک هەستا چاوی لە دەوروبەر کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئێستا ئیتر دەبێ نزیکی بەیانی بێ. وا چاکە چاوێک لە کاتژمێرەکەم بکەم. بەڵام ئەگەر قۆپچەکانم بکەمەوە لە سەرمانا ڕەق دەبم. کوڕە چش، با تۆزێ سەرمام بێ، بە جێی ئەوە ئەگەر بۆم

دەرکەوێ نزیک بەیان بەردانە خەیاڵم تەخت دەبێ و دڵم دەحەسێتەوە. ئەو کاتە ئەسپەکە لە کاشە دەکەینەوە و وەرێدەکەوین.» ڤاسیلی ئاندرێڤیچ لە ناخی دڵیدا هەستی دەکرد کە هێشتا زۆری شەو ماوە و ئەو ترسەی دلی داگرتبوو بەردەوام پەرەی دەساند و خەریک بوو هێوابڕاوی دەکرد، بەڵام دەیویست خۆی لەو ڕاستییە گێل بکات و خۆی فریو بدات. بە پارێزەوە قۆپچە و ئاغزونەی کەڵپۆسەکەی کردەوە و دەستی کرد بە باخەڵیدا و ماوەیەک دەستی لە گۆچووی بە باخەڵیدا گێڕا تا ئاخری توانیی گیرفانی ئیلەگەکەی بدۆزێتەوە و کاتژمێرە زێوینەکەی کە وێنەی گوڵی مینای پێوە بوو دەریهێنا. بەڵام بەو تاریکەشەوە هیچی بۆ دەرنەدەکەوت. دیسان چۆکی دادا و هەنیشکی نایە سەر تەرکی کاشەکە و بە باڵتەکەی پەنابای دروست کرد وەک ئەو کاتەی جگەرەی داگیرساند شقارتەکەی لە گیرفانی باڵتۆکەی دەرهێنا و دەستی کرد بە هەڵکردنی لقە شەمچەکان. ئەمجارەیان زیاتر سەرنجی دا و بە قامکی سڕی لقێکی هەڵبژارد کە سەرەکەی لەوانی دیکە درشتتر و لەوانی دیکەی زیاتری گۆگرد پێوە بوو. شەمچەکە بە یەکەم ڕێخشاندن هەڵبوو و سەفحەی کاتژمێرەکەی لە بەر شۆڵەی شقارتەکە گرت و چاوی لێکرد بەڵام ئەوەی دیتی باوەڕی نەکرد. تازە دە خولەکی لە نیوەشەو لادابوو. شەوێکی درێژیان لەبەر بوو. «پەککوو لەو شەوە درێژە!» تەزوویەک بە لەشیدا هات و هەستی کرد پشتی بۆتە یەک پارچە سەهۆڵ. قۆپچەکانی داخستەوە و باڵتەکەی توندتر لە خۆی پێچا و خۆی خزاندەوە سووچی کاشەکە و مات و بێدەنگ هەڵکورما، هەوڵی دا خۆڕاگرانە ددان بە خۆیدا بگرێ و

چاوەڕوانی بەیانی بێ. لە ناکاو لە نێوان هاژە و گڤەی بایەکەدا بە ڕوونی دەنگێکی تازە و گیانداری بیست، ئەو دەنگە وردە وردە و زیاتر دەبوو و دوای ئەوەی تەواو دەنگی دەردەکەوت و لەو دەشتەدا دەبوو بە زایەڵە، وردە وردە کەم دەبۆوە و بێدەنگ دەبوو. شکی تێدا نەبوو کە ئەو دەنگە لوورەی گورگە و گورگەش هێندە نزیک بوو کە ڤاسیلی ئاندریێڤیچ هەستی دەکرد چیرەی کەڵپە و شەویلاکەی دەبیستێ کاتێک زیروبەمی لوورەلووری دەشتەکەی دادەگرت. ڤاسیلی ئاندریێڤیچ ملیوانەی کەڵپۆسەکەی لە سەر گوێچکەی لابرد و بە وردی گوێی هەڵخست. ئەسپەکەش گوێچکەی قوت کردبۆوە و بۆ لای دەنگەکە ئاوڕی دابۆوە، کاتێک لوورەی گورگەکە ڕاوەستا، ئەسپەکە سمی لە عەرزی دەکوتا و بۆ وریایی پێدان پڕ بە کونە لووت و لمبۆزی دەیپڕماند. دوای ئەوە ڤاسیلی ئاندریێڤیچ نەک نەیتوانی بخەوێ بەڵکوو حەجمانیی لێ هەڵگیرا. هەرچی هەوڵی دەدا بیر لە داهات و مامەڵە و ناوبانگ و سامان و ئابرووی خۆی بکاتەوە، ترس زیاتر و زیاتر بە سەریدا زاڵ دەبوو، بۆ ئەوەش داخی لێ دەهات کە بۆچی شەیتان چووە کڵێشەیەوە و لە مۆلچانۆڤکا نەمایەوە، هەر ئەو داخەش وای لێکردبوو نەتوانێ بە سەر بیر و خەیاڵەکانیدا زاڵ بێت ولێی تێکەڵ‌وپێکەڵ دەبوو.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەزیاد نەبێ چ دارستانێکە، بەبێ ئەو مێشەیەش شوکر بۆ خودا کاروبارم باش بوو. دەڵێن مەستەکان زووتر لە نێو بەفر و شەختەدا ڕەق دەبن. منیش خۆ ڤۆدکام کەم نەخواردۆتەوە!» کاتێک بە وردی بیری لە حاڵ‌وباڵی خۆی دەکردەوە

هەستی کرد دەلەرزێ و خۆشی نەیدەزانی ئەو لەرزینەی بە هۆی چییەوەیە؟ لە سەرمانایە یان لە ترسانا و هەوڵی دا وەک ئەو خۆی داپێچێ و بخەوێ. بەڵام دیتی ناتوانێ و ئاراوقارای لێ هەڵگیراوە. لە سەر هیچ بارێک ئۆقرەی نەدەگرت. دەیویست هەستێ و کارێک بکات تاکوو بە سەر ئەو ترسەدا زاڵ بێ کە نیشتبووە دڵی و خۆی لە هەمبەریدا بەبێ هێز و دۆڕاو دەزانی. دیسان قوتووی جگەرە و شەمچەکەی دەرهێنایەوە بەڵام تەنیا سێ لقی تێدا مابوو و ئەوانیش گۆگردەکەیان هەڵوەریبوو و هەڵنەدەبوون.

گوتی: «تۆشم بەزیاد نەکرد، نەگبەتی!» خۆشی نەیدەزانی جنێو بە کێ بدات و لە کێ تووڕە بێ. جگەرەکانی وردوپرد کرد و فڕێیدا سەر بەفرەکە. ویستی قوتووی شقارتەکەش فڕێدا بەڵام پاشگەز بۆوە و نایەوە گیرفانی باڵتۆکەی، هێندە پەرۆش و شێواو بوو نەیدەتوانی بە هیچ جۆرێک و لە سەر هیچ بارێک ئۆقرە بگرێ. لە کاشەکە هاتە دەرێ و پشتی کردە بایەکە و ڕاوەستا، کەمەربەندەکەی کردەوە، تۆزێ هەڵیکێشا و لە سەر ناوکی توندتر بەستی.

لە ناکاو ئەو بیرە بە مێشکیدا هات «بۆ دەتەوێ وەک لاشە بکەوی و چاوەڕوان خۆت مەلاس دەی هەتا دەمری؟ سوار بە و بڕۆ! ئەسپ ئەگەر سواری لە سەر پشت بێ، خۆی لە ئاو و ئاور دەرباز دەکا!» کە نیکیتای وەبیر هاتەوە بە خۆی گوت: «لێی گەڕێ با بمرێ و بحەسێتەوە. خۆ ژیانەکەی لە مردنەکەی باشتر نییە! خۆ مردن و زیندوو بوونی هیچ جیاوازییەکی نییە. خۆی لە خودای دەوێ بمرێ.

بەڵام من شوکور بۆ خودا، ژیان و سامانم هەیە، ملک و زەوی‌وزارم هەیە و لەبەر ئەوانەش بێ دەبێ زیندوو بم!»

ئەسپەکەی کردەوە و هەوسارەکەی لە ملی کرد و ویستی سوار بێ، بەڵام باڵتە و چەکمەکانی هێندە قورس بوون نەیتوانی. پاشان چووە سەر کاشەکە بەڵکوو بتوانێ لەوێوە سواری ئەسپەکە بێ، بەڵام کاشەکە لە بەر قورسییەکەی خزی و دیسان نەیتوانی سوار بێ. بۆ جاری سێهەم ئەسپەکەی هێنایەوە پێشێ و بە پارێزەوە چووە سەر لێواری کاشەکە و ئاخری توانیی بە زگەوە خۆی بدا بە سەر پشتی ئەسپەکەدا و وەک تەرم سەرولاقی بەملاولادا شۆڕ بۆوە. دوای ئەوەی چەن ساتێک بەو جۆرە بە سەر پشتی ئەسپەکەوە مایەوە، چەند جار هەوڵی دا خۆی بسووڕێنێ و ڕاست بێتەوە، ئاخری لاقێکی خستە ئەودیوی زگی ئەسپەکە و سوار بوو لاقی نایە سەر قایشی لاغاوی ئەسپەکە و خۆی ڕاست کردەوە. تەپوکوت و سوار بوون و کەوتنەوەی ڤاسیلی ئاندرێڤیچ نیکیتای لە خەو هەستاندبوو. هەستا دانیشت و ڤاسیلی ئاندرێڤیچ پێی وا بوو نیکیتا شتێکی پێگوت.

دەنگی هەڵبڕی: «هەڵەم کرد کە ئەقڵی خۆم دایە دەست تۆی بێ‌شعوور. بۆ دەبێ خۆم بە هۆکاری هیچ‌وپووچ بکەمە قوربانیی زریان و تۆف‌وبەندی بیابان؟» ئاتەگی باڵتەکەی لە سەر چۆکی ڕێکوپێک کرد و سەری ئەسپەکەی وەرسووڕاند و ڕاست بەو شوێنەدا کە پێی وا بوو بەرەو مێشەکە دەڕوا ئەسپەکەی لێخوڕی و دوور کەوتەوە.

## (٧)

نیکیتا لەو کاتەوە کە لبادەکەی لە خۆی پێچابوو لە پشت کاشەکە و لە نێو بەفرەکەدا دانیشتبوو، جووڵەی نەکردبوو. ئەو وەکوو تەواوی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ سروشت دەستەویەخەن و لە حەسانەوە و ئاسوودەیی بێبەشن، خۆڕاگر و پشوودرێژ بوو. ئەو دەیتوانی چەند سەعات و تەنانەت چەند ڕۆژیش بێئەوەی پەریشان بێ یان ڕقی هەستێ، چاوەڕوان بمێنێتەوە. گوێی لە دەنگی ئاغاکەی بووبوو کە قاوی لێکردبوو، بەڵام وەڵامی نەدابووە، چونکە حەزی نەدەکرد بجووڵێتەوە یان قسە بکات. هەرچەندە هێشتا گەرمایی چاییەکە و هەڵسووڕان و ماندوو بوون لە نێو بەفرەکەدا بۆ دۆزینەوەی ڕێگا هەر مابوو؛ دەیزانی ئەو گەرمایە زۆر ناخایێنێ و ئیتر هیچ هێز و تینێکی نەماوە تاکوو دیسان خۆی ماندوو بکات و گەرمی بێتەوە، چونکە دەیزانی و هەستی دەکرد لەبەر شەکەتی وەکوو ئەسپێک وایە کە بڕستی لێ بڕابێت و هەرچەندە بیدەنە بەر زەبری قامچی، لە جێی خۆی نابزوێ و خاوەنەکەی تێدەگا ئەگەر دەیهەوێ ئەسپەکەی بکەوێتەوە بەر کار و بتوانێ بە ڕێدا بڕوا، دەبێ لێیگەڕێ پشووی بێتەوە بەر و وێنجەی بداتێ. یەکێک لە قامکەکانی، ئەوەیان کە بنی چەکمەکەی کون بوو، سڕ بووبوو و قامکە کەلەی دەتگوت پێوە نییە و جگە لەوەش ئازای ئەندامی جار لەگەڵ جار ساردتر و ساردتر دەبۆوە و هەستی بە لەرز و سەرما دەکرد. پێی وا بوو لەوانەیە و زۆر وێدەچێ هەر ئەو شەوە لە سەرمانا ڕەق هەڵێ. بەڵام ئەو فکرە هێندە تاڵ نەبوو بە لایەوە و ترسیشی لێی نەبوو. بیری مەرگ

بێزاری نەدەکرد و لێی نەدەترسا چونکە لە ژیانیدا قەتی خۆشی و ئاسوودەیی نەدیبوو و بە پێچەوانە بەردەوام لە خزمەتی ئەم و ئەودا ژیانی تێپەڕاندبوو و قەت نەحەسابۆوە، بۆیە ئیتر لەو ژیانە بێزار بووبوو. بیری مردن هیچ ترسێکی نەدەخستە دڵیەوە چونکە دەیزانی جگە لە ئاغایەکی وەک ڤاسیلی ئاندرێڤیچ کە ئەو خزمەتی پێدەکردن بەردەوام خۆی بە نۆکەر و دەسبەسەری ئاغایەکی تر دەزانی. ئەویش ئەو ئاغا بوو کە ئەوی تووشی ئەم ژیانە کردبوو و دەیزانی دوای مردنیش دەبێتە بەردەستی ئەو و ئیتر ئەو ئاغایە هەڵێنافریوێنێ و ئازاری نادا. هەڵبەت زۆریشی پێخۆش نەبوو لەو ژیانە ئاشنا و خووپێگرتووەی ئێستای دابڕێ، بەڵام چارەی نەبوو. خووی بە ژیانی داهاتووشی دەگرت.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەی تاوانەکانم دەبێ بە چی؟» بیری لە مەیئۆشینەکانی کردەوە، ئەو پارانەی لە سەر ئارەق و ڤۆدکای دانابوو و ئەو داخ و دیقەی کردبوویە دڵی ژنەکەیەوە و ئەو جنێو و قسە سووکانەی پێدابوو و ئەو یەکشەممانەی کە نەچووبوو بۆ کڵێسە و ئەو ڕۆژووانەی نەیگرتبوو و هەموو ئەو کارە خراپ و هەڵانەی کە قەشە دوای تۆبە پێدادانەکەی سەرکۆنەی کردبوو. «دەی، دیارە، باری تاوانەکانم سووک نییە. بەڵام خۆ ئەو هەڵە و تاوانانە بە ئیختیاری خۆم ئەنجامم نەداون، خودا خۆی منی وا دروست کردووە. من چبکەم؟ خۆ دەسەڵاتم نییە. چۆن دەکرێ تاوان نەکەی؟ کێ لە سەر ئەو عەرزە هەیە تاوانی نەکردبێ؟»

ئەو لە بیری ئەوەدا بوو کە ئەو شەوە لەوانەیە چ بەڵایەکی بە سەر بێ. بەڵام دوای ئەو، ئیتر بیری لەو شتانە نەکردەوە و خۆی دایە دەست شەپۆلانی بیرەوەرییەکانی کە یەک لە دوای یەک لە زەینیدا سەریان

هەڵدەدا. هێندێ جار بیری لە مارفا دەکردەوە و سەرخۆش بوونی خزمەتکاران و تۆبە کردنی لە خواردنەوەی ڤۆدکا و هێندێ جاریش بیری لەم سەفەرەی دەکردەوە و ماڵی تاراس و دەمەقاڵێی باوک و کوڕ لە سەر بەش‌کردنی ماڵ و سامان و لەبەر یەکچوونی بنەماڵە و هێندێ جاریش منداڵەکەی خۆی وەبیر دەهاتەوە و لە بیری ئەسپەکوێتدا بوو کە ئێستا پشتی لە ژێر بەڕەکەدایە و کزەبا و سەرما لێی نادا. هەروەها لە بیری ئاغاکەیدا بوو کە جینگڵی لە خۆی دەدا و لە سەرمانا دەلەرزی. گوێی لە تەقوکوتی کاشەکە و گڤەی با و خشەخشی شەمچەی ئاغاکەی بوو کە دەیویست جگەرە داگیرسێنێ. نیکیتا لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «تۆ خۆشت براکەم وەک سەگ پەشیمانی کە لە ماڵی تاراس نەمایەوە، ئێستاش بەجێ‌هێشتنی ئەو ماڵ و ژیان و سامانە و ماڵئاوایی لێ کردنیان ئاسان نییە. خۆ تۆ وەک ئێمە سواڵکەر و لە برسا مردوو نیی کە ژیان بە لاتەوە تاڵ بێ و حەز بە مەرگ بکەی!» ئەم بیر و خەیاڵانە لە زەینیدا تێکدەئاڵان و ئاخری پێڵووی چاوی قورس بوو و خەوی لێکەوت.

کاتێک کە ڤاسیلی ئاندرێڤیچ ویستی سواری ئەسپەکە بێ و کاشەکە لە ژێر پێیدا خزی و لای دواوەی کاشەکە کە نیکیتا پاڵی پێوە دابوو بۆ لایەک خزی، خێشکی ژێرەکەی لە پشتی درا و لە خەوی ڕاپەند. نیکیتا کە خەبەری بۆوە ناچار بوو باری دانیشتنەکەی بگۆڕێ. زۆر بە زەحمەت لاقی بەرز کردەوە و بەفرەکەی لێ داتەکاندن. هەستا و هەستی کرد تەزووی سەرمایەکی بەژان لە ناکاو وەک ڕم لە پشتی هەڵچەقی و هەتا جەرگ و هەناوی چووە خوار و بۆی دەرکەوت تووشی چ ڕۆژە ڕەشییەک بوون و ئاغا خەریکی چییە. تەنیا دەیویست ڤاسیلی ئاندرێڤیچ

ئەو لبادەی بۆ بەجێبێڵێ کە پێویستی پێی نییە و تۆزێ خۆی پێ داپۆشێ، ئەو هاوارەش کە لێی هەستا، هەر ئەوە بوو.

بەڵام ڤاسیلی ئاندرێڤیچ ڕانەوەستا و لە نێو بەفر و تاریکیدا بزر بوو.

نیکیتا کە بە تەنیا مایەوە بۆ ماوەی چەند خولەکێک چوو دەماڵی فیکرەوە و کەوتە بیری ئەوەی چ بکا. توانایی ئەوەی لە خۆیدا شک نەدەبرد کە هەستێ و بۆ شوێنێکی پەنابا بگەڕێ. مانەوە لە جێی پێشووشی نەدەگونجا، چونکە ئەو کایەی ڕایخستبوو کەوتبووە ژێر بەفر و دەیزانی لە نێو کاشەکەشدا گەرمی نابێتەوە، چونکە هیچی پێ نەبوو بە خۆیدا بدا و جلەکانی ئیتر گەرمایان پێ نەدەبەخشی و دەتگوت پارچەیەک سەهۆڵن لەبەری هەڵکشاون. هێندەی سەرما بوو دەتگوت ئازای ئەندامی بۆتە سەهۆڵ و هەرئێستا لە سەرمانا ڕەق دەبێ. ترسی لێ نیشت. پەنای بۆ خودا برد و گوتی: «خودای مەزن، باوکی ئاسمانی! تۆ ڕوحمێکم پێ بکە!» ئەوەی لێ ڕوون بوو کە بە تەنیا نییە و کەسێک هاواری دەبیستێ و بە تەنیا جێی ناهێڵێ، بۆیە ئەو دڵنیاییە تۆزێ ئۆخژنی پێ بەخشی و هێوری کردەوە. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بێئەوەی لبادەکەی لە خۆی بکاتەوە، چوو بۆ نێو کاشەکە و لە جێگای ئاغاکەیدا خۆی کوشمەڵە کرد.

بەڵام لە نێو کاشەکەشدا بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی خۆی گەرم بکاتەوە. سەرەتا سەرتاپای کەوتە لەرزین و ددانی وەددانی نەدەکەوت. دوای لەرزینێکی زۆر وردە وردە لەشی سڕ بوو، لەرزەکەی نەما و وەک بێهۆشی لێهات و دڵی سست بوو. نەیدەزانی خەریکە دەمرێ یان خەوی لێدەکەوێ، بەڵام هەرکامیان بوو ئەو خۆی بۆ هەردووکیان ئامادە کردبوو.

(٨)

لەو کاتەدا ڤاسیلی ئاندریڤیچ بە زەبری پاژنە و قایشی هەوسار کە وەکوو قامچی لە لاشانی ئەسپەکەی دەدا بەرەو شوێنێک غاری دەدا کە ڕوون نەبوو بۆچی پێیوایە مێشەکە و ماڵۆچکەی مێشەوان لەو لایەوەیە. بەفر و کەڕەسیسە برژۆڵەکانی پێکەوە نووساندبوو و بایەکەی هێندە بەقەوەت بوو دەتگوت لە جێی خۆی ڕایدەگرێ. بەڵام خۆی بە سەر ئەسپەکەیەوە کۆم کردبۆوە و ئاتەگی باڵتەکەی کە بەردەوام بەدەم باوە دەشەکایەوە بە دەستەکەی دیکەی دایدەدایەوە، هەوڵی دەدا و دەیویست بیخاتە ژێر خۆی و زینە ساردەکەوە کە نەیدەهێشت بە ئاسوودەیی دانیشێ و لەگەڵ ئەوەشدا بە پڕتاو ئەسپەکەی لێدەخوڕی. ئەسپەکە ئەگەرچی زۆر بە دژواری دەیتوانی لە نێو بەفرەکەدا هەنگاو هەڵێنێتەوە بەڵام ملی بە فەرمانی سوارەکەی دەدا و ڕاست بەو ڕەوگەیەدا غاری دەدا کە فەرمانی پێدەدرا.

ڤاسیلی ئاندریڤیچ چەند خولەکێک بەو شێوەیە ڕۆیشتە پێشێ و پێی وابوو ڕاست دەڕوا، ئەو جگە لە سەری ئەسپەکە و شەوی تاریک و دەشتی سپی هیچیتری نەدەدی، لە گڤەی با زیاتر کە بە پەناگوێی ئەسپەکە و بە کەڵێنی ملیوانەی باڵتەکەیدا دەهات هیچ دەنگێکی تری نەدەبیست.

لە ناکاو تارماییەک لە پێشەوە دەرکەوت. لە خۆشیانا کەوتە دڵەکوتێ و سەری ئەسپەکەی بۆ لای وەرسووڕاند، چونکە پێی وا بوو دیواری ماڵانە و لە گوند نزیک بۆتەوە. بەڵام ئەو تارماییە وەک دیوار

بێجووڵە نەبوو و بەردەوام دەجووڵایەوە و بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەو، گوند نەبوو بەڵکوو دەوەنی بەرزی گوڵەبەڕۆنە بوو کە لە نێوان دوو مەزرادا شین بووبوو و بەفر داینەپۆشیبوو، لەبەر شالاوی توندی بادا خۆی نەدەگرت و هەرجارەی بە لایەکدا دەنووشتایەوە، گڤە و هاژەی با لە نێوان لقوپەلەکانیدا ڤیژەی دەهات و خۆشی نەیدەزانی بۆ بە دیتنی ئەو دەوەنە کە بووبووە قوربانیی دەستی گژەبای بێبەزەیی، ترسێک شکایە گیانی. بەتاو غاریدا و لە دەوەنەکە دوور کەوتەوە و نەیزانی بۆ گەیشتن بەو دەوەنە لە ڕێگاکەی لایداوە و پێی وا بوو هەروا کەوتۆتەوە سەر بارەکەی پێشوو. بەڵام بە تەواوی لە ڕەوگەکەی لایدابوو. هەروا دەڕۆیشت و پێی وابوو بەرەو مێشەکە وماڵۆچکەی مێشەوان دەڕواتە پێشێ. بەڵام ئەسپەکە بەردەوام بەرەولای ڕاست بایدەدایەوە و ڤاسیلی ئاندریێڤیچ هەوڵی دەدا بەرەو لای چەپ بایداتەوە.

دیسان تاپۆیەکی ڕەش لە پێشیەوە وەدیار کەوت و خۆشی لە دڵی گەڕا، چونکە ئەمجارەیان دڵنیا بوو گەیشتۆتە گوندێک، بەڵام ئەمجارەشیان مەرزی نێوان دوو مەزرا بوو کە دەوەنی گوڵەبەڕۆنەی لێ ڕوابوو. ئەم دەوەنەش وەک دەوەنەکەی پێشوو بە دەم گژەباوە ڕادەوەشا و دەنووشتایەوە و هەڵدەستایەوە و مەعلووم نەبوو بۆچی ترس دەخاتە دڵی ڤاسیلی ئاندریێڤیچەوە. ئەو تاپۆیە نەک هەر دەوەنەکەی پێشوو بوو بەڵکوو لە پەنایدا چاوی بە جێ سمی ئەسپ کەوت کە وردە وردە خەریک بوو بەفر پڕی دەکردەوە. ڤاسیلی ئاندریێڤیچ ڕاوەستا. دانەوی و بە وردی چاوی لێکرد، دیتی جێ پێی

ئەسپە و لەڕێوە تێگەیشت جێ پێی ئەسپەکەی خۆیەتی. دیار بوو دەوری لێداوەتەوە و هاتۆتەوە شوێنەکەی پێشووی، لە دڵی خۆیدا گوتی: «تازە دەرچووو، لەم دەشتە حەیاتم لێ دەبڕێ و کەس پێم نازانێ.» بەڵام بە مەبەستی ئەوەی کە خۆی تەسلیمی ترس نەکات ئەسپەکەی بە خێراییەکی زیاترەوە تاودا و چاوی لە تەم و تاریکی بڕی. پێی وا بوو لەو تاریکییەدا چەن خاڵی ڕووناک دەترووسکێنەوە و کاتێک بە وردی چاوی تێدەبڕین بزر دەبوون. جارێک پێی وا بوو لوورەی گورگ و وەڕینی سەک دەبیستێ، بەڵام ئەو دەنگانە هێندە کز و لێڵ بوون کە نەیدەزانی بە ڕاستی ئەو دەنگانە دەبیستێ یان گوێی دەزرینگێتەوە، ڕاوەستا و بە وردی گوێی شل کرد.

لە ناکاو دەنگێکی ترسناک و گوێدڕ لە بن گوێیدا بێدەنگیی شەو و بیابانەکەی شکاند، ئەوەندەش ترسناک بوو کە سەرتاپای خستە لەرزین و دڵەکوتەی پێکەوت. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ دەستی لە ملی ئەسپەکە دا، ئەویش وەک مێژۆکە دەلەرزی و دەنگە ترسناکەکە بەرزتر دەبۆوە. هەتا چەند ساتێک نەیتوانی وەخۆ بێتەوە و تێبگا کە چی ڕووی داوە. بەڵام ئەو دەنگە ئەسپەکەی بوو دەیحیلاند و بۆ ورە وەبەرخۆنان یان یارمەتی خواستن، ئاوا دەنگی بەرز و بڕووسکەئاسای لە ناخی شەو و دەشتەکەدا دەبوو بە زایەڵە. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ گوتی: «ئاخ، بێزمانی نەگبەتی، خووداڕت کردم!» بەڵام ئەگەرچی هۆی ترسەکەی خۆی بۆ دەرکەوت، بە ئاسانی نەیدەتوانی بە سەریدا زاڵ بێ و لە ترسانا نەلەرزێ.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەبێ خۆێنسارد بم و بیر بکەمەوە!» لەو بارودۆخە نالەبارەدا نەیدەتوانی ترس و دڵەخورپە لە خۆی دوور بخاتەوە و بەپڕتاو غاریدەدا و نەیدەزانی ئیتر بەرەوڕووی با ناڕوات و پشتی کردۆتە بایەکە. لارانەکانی کە لێک بلاو بووبوون و لە زینەکە دەدران، بووبوونە یەکپارچە سەهۆڵ و ژانیان دەکرد. دەست و لاقی دەلەرزین و دڵی وا بە پڕتاو لێیدەدا کەوتبووە هەناسەبڕکێ. دەیدی کە لە نێو ئەو تۆفوبەند و دەشتە بێپایانەدا گیری خواردووە و مردن و ڕەقهەڵاتنی یەکجارییە و ئیتر ڕێگای ڕزگار بوونی بۆ نەماوەتەوە.

لە ناکاو ئەسپەکە لە ژێریدا چەقی و هەتا بنزگی لە کۆمایەک بەفردا نوقم بوو و کەوتە جینگڵ لەخۆ دان و بە لادا کەوت. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ دابەزی و ئەو قلێشەی بۆ لایەک کێشا کە لاقی پێوە بەند کردبوو. هەر لەگەڵ دابەزینی ئەو، ئەسپەکە لە جێی خۆی ڕاستەوە بوو، بۆ پێشەوە تەکانێکی لە خۆی دا و چەند بازی دا و حیلاندی، ئەو بەرەیەی نیکیتا دابووی بە سەر پشتیدا بە لاتەڕافیدا شۆڕ بووبۆوە، بە دوای خۆیدا ڕایدەکێشا و لە بەرچاو بزر بوو و ڤاسیلی ئاندرێڤیچی لە نێو ئەو بەفر و تاریکی و تۆفوبەندەدا بەجێهێشت. دەیویست بە دوای ئەسپەکەدا ڕاکا، بەڵام بەفرەکە هێندە زۆر بوو هەتا سەروو چۆکی دەچووە خوارێ و باڵتەکانی بەری هێندە قورس بوون، نەیدەتوانی هەنگاو هەڵێنێتەوە، بۆیە دوای بیست هەنگاو ئیتر کەوتە هەناسەبڕکێ و لە جێی خۆی تەکانی لێبڕا. کەوتە بیری لێڕەوار و مەڕەکانی کە فرۆشتبوونی و ئەو مڵکانەی کە بە ئیجارەی

دابـوو، هـەروەهـا بیـری لـە دووکانـەکـەی و قـاوەخانـەکـانی و ماڵـە شیروانیدارەکەی و وەلیعەهدەکەی کردەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «چۆن دەتوانم دڵ لەوانە بەردەم؟ ئەو بەڵایە چی بوو ئاوا کتوپڕ بە سەرم هات؟ ئاخەر مەگین شتی وا دەبێ؟» ئەو بیرانە و خەیاڵی سامان و مڵکەکانی کە دەبوو دەستیان لێ بەردا، لە زەینیدا دەهات و دەچوو. مەعلووم نەبوو بە چ هۆیەک بنچکی گوڵەبەڕۆنەکەی وەبیر هاتەوە کە بە دەم باوە ڕادەوەشا و ئەو دوو جار بە لایدا تێپەڕیبوو و ترسێکی وەهای خستبووە دڵیەوە کە نەیدەتوانی باوەڕ بکات ئەوەی بە سەری دێ ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەمانە بڵێی هەمووی خەون نەبن؟» دەیویست خەبەری بێتەوە. بەڵام چ خەبەر بوونەوەیەک؟ چ ڕاستییەک لەوە ڕوونتر کە کلووی بەفر بە توندی دەدران بە دەموچاویدا و چزەیان لێ هەڵدەستاند. لەشی هەتا سەر یەسقان تەزیبوو و دەستی ڕاستی کە بێدەستێکش مابۆوە لە سەرمانا گوێ نەدەکرد. دەشتەکە دەشتێکی ڕاستەقینە بوو و ئەو لەو سەرما و چۆڵەوانییەدا تەنیا و سەرگەردان کەوتبوو، ڕاست وەک ئەو بنجە گوڵهەنگە تەنیا بوو کە ترسی خستبووە دڵیەوە. شەکەت و کەسیرە و بێدەرەتان چاوەڕوانی مەرگ بوو، مەرگێکی ڕاستەقینە و زووڕەس و بێمانا.

ئەو دۆعایەی وەبیر هاتەوە کە دوێنێ لە کلێسە خوێندبووی و وێنەیەکی دەموچاو ڕەش کە لە قەتحەیەکی زێڕین گیرابوو، ئەو مۆمانەی کە بۆ هەڵکردن لە بەردەمی ئەو وێنەیەدا خۆی بە کلێسای فرۆشتبوو و هەر لەڕێوەش بۆیان هێنابۆوە، ئەو مۆمانەی کە

سەرەکەیان سووتابوو دیسان خستبوویەوە نێو قوتووەکانیان تاکوو دیسان بیانفرۆشێتەوە، لە دڵی خۆیدا دۆعاکەی دووپات دەکردەوە: «یا حەزرەتی مریەم، خاتوونی بەهەشت، یا نیکۆلای پاقژ، مامۆستای پارێزگاری!...» ئێستا دەستەوداوێنی ئەو نیکۆلا پاقژە بووبوو تاکوو پەرجۆیەک بنوێنێ و ئەو لەو تەنگژە و لێقەوماوییە ڕزگار بکات. هەروەها نەزری دەکرد کە دۆعای بۆ دەخوێنێ و مۆمی پێشکەش دەکا. بەڵام لەو کاتەدا بە ڕوونی تێگەیشت و دڵنیا بوو کە ئەو وێنە پیرۆزە و قەتحە زێڕینەکەی و مۆمەکان و قەشە و دۆعا و پاڕانەوە ڕەنگە لەوێ، یانی لە کڵێسە زۆر گرینگ و بەجێ و پێویست بن، بەڵام بۆ ئەو لێرە، لەو دەشتە تاریک و سەغڵەتەدا هیچ کاریگەرییەکی نییە و لە نێوان ئەو مۆمانە و دوعاکان و لێقەومان و بێدەرەتانیی ئەودا هیچ پێوەندییەک بوونی نییە و ناکرێ بوونیشی هەبێ. بە خۆی گوت: «بەڵام نابێ ناهومێد بم. دەبێ شوێنپێی ئەسپەکە هەڵگرم و بڕۆم، دەنا باڕن و بادەوە پڕی دەکاتەوە. ئەوەی لەو تەنگژەیە ڕزگارم بکات، هەر ئەوەیە. ڕەنگە بتوانم دیسان بە ئەسپەکە بگەمەوە. بەڵام نابێ پەلەپەل بکەم، دەنا لە بەفر هەڵدەچەقێم و ئیتر کار لە کار دەترازێ و ڕەق هەڵدێم!» بەڵام سەرەڕای ئەوەی دەیویست بە هێواشی بڕوا، بە قەڵەمباز دەڕۆیشت و ڕچەی دەشکاند، بەردەوام دەکەوت و هەڵدەستایەوە و دیسان لاقی لە بەفرەکە هەڵدەچەقی و بە دەمەوە دەکەوت و زۆر جار سینگ و دەموچاوی لە نێو بەفرەکەدا نوقم دەبوو. جێپێی ئەسپەکە لەو شوێنانەی کە بارستایی بەفرەکە کەم بوو، ئیتر بە زەحمەت دەبیندرا و کڕێوە و باڕن پڕی کردبۆوە.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ لە دڵی خۆیدا گوتی: «نا، ئیتر ڕزگار بوونم مەحاڵە. جێپێی ئەسپەکەم بۆ نادۆزرێتەوە و ئیتر دەستم بە ئەسپەکە ڕاناگا.» بەڵام هەر لەو کاتەدا چاوێکی لە پێشەوەی خوی کرد و تارماییەکی دی. کە جوانتر سەرنجی دا ئەسپ بوو، نەک هەر ئەسپەکە، بەڵکوو کاشە و ماڵبەنەکانیش ڕاست چەقابوون و ئەو شاڵەی پێوەی بەسترابوو بە دەم گژەباوە دەشەکایەوە. ئەسپەکوێت بە بەرەکەی سەر پشتییەوە کە بە لایەکدا شۆڕ بووبۆوە و زین و هەوسارەکەی لەگەڵ خۆی داکێشابوو، سەری ڕادەتەکاند و دەیویست هەوسارەکە لە ملی خۆی بکاتەوە و ڕزگاری بێ لە دەستی. دەرکەوت ڤاسیلی ئاندرێڤیچ ڕاست لەو هەرەدا لە نێو بەفردا گیری خواردووە کە ئەو کاتەی نیکیتای لەگەڵ بوو پێکەوە گیریان خواردبوو. ئەسپەکە بە شێوەی خۆماک گەڕابۆوە بۆ لای نیکیتا و کاشەکە و ئەویشی بە دوای خۆیدا هێنابوو. هەروەها بۆشی دەرکەوت کە پەنجا هەنگاو لەولای کاشەکەوە لە ئەسپەکە دابەزیوە و تووشی ئەو چەرمەسەرییە بووە.

## (٩)

کاتێک ڤاسیلی ئاندریێڤیچ بە دەم کەوتن و هەستانەوەوە گەیشتەوە لای کاشەکە، دەستی کێشا لێوارەی کاشەکەی گرت و ماوەیەک بێجووڵە لە پەنای ڕاوەستا، تۆزێ هێور بووە و هەوڵی دا دڵەکوتە و هەناسەبڕکێکەی بێتەوە سەر باری ئاسایی، بەڵام نیکیتای لە سەر شوێنەکەی پێشووی نەدی. کە چاوی لە نێو کاشەکە کرد شتێکی دی لەویدا کەوتووە و بەفر دایپۆشیوە، وای بۆچوو کە دەبێ ئەو بێ. ڤاسیلی ئاندریێڤیچ ئیتر ترسەکەی ڕەوییەوە و ئەو تۆزە دڵەخورپەیەش کە مابووی هی ئەوە بوو دەترسا ئەو تاپۆیەی کاتی ڕۆیشتنەکەی و کاتی گیرخواردن لە نێو بەفرەکەدا، دیسان بە سەر دڵیدا زاڵ بێتەوە. دەبوو هەرچۆنێکە بەرگری لە هاتنەوەی ئەو ترسە بکات و بەو مەبەستە دەبوو کارێک بکات و خۆی بە شتێکەوە سەرقاڵ بکات. یەکەم کارێک کە کردی ئەوە بوو پشتی کردە بایەکە و ڕاوەستا. پاشان قۆپچەی باڵتەکەی کردەوە و دوای ئەوەی هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵکێشا، چەکمەکانی داکەند و بەفرەکەی لێ داتەکاندن. هەروەها دەستکێشەکەی دەستی چەپەشی داکەند و هەڵیگێڕایەوە و بەفرەکەی لێ داتەکاند. دەستکێشی دەستە ڕاستیشی مەعلووم نەبوو لە کوێ ونی کردووە و ئێستا لە هەر کوێ بێ، دەبێ کەوتبێتە ژێر گەردالێک بەفرەوە. دوای ئەوە کەمەربەندەکەی لە نێوقەدی توند کرد، ڕاست بەو جۆرەی خووی پێگرتبوو، یانی ئەو کاتەی لە دووکانەکەی دەهاتە دەرێ تاکوو گەنمی ئەو گوندنشینانە بکڕێ کە بە عارەبانە بۆیان هێنابوو، دوای توندکردنی کەمەربەندەکەی خۆی بۆکار

ئامادە کرد. یەکەم کار کە دەبوو بیکا ئەوە بوو کە قایشی هەوسارەکە لە لاقی ئەسپەکە بکاتەوە. ڤاسیلی ئاندریئیڤیچ ئەو کارەی کرد و ئەسپەکەی دیسان بە قولاپی ئاسنینی پێشەوەی کاشەکە، جێگاکەی پێشوویەوە بەست. پاشان چووە پشت ئەسپەکە تاکوو قایشی زین و لەغاوەکەی توند بکاتەوە. لەو کاتەدا دیتی لە نێو کاشەکەدا شتێک دەجووڵێتەوە و سەری نیکیتا کە بەفر داپۆشیبوو وەدیار کەوت. نیکیتا کە دیار بوو خەریکە سەرما دەیبا، زۆر بە زەحمەت هەستا دانیشت و بە تەکانێکی سەیر وەک ئەوەی بیهەوێ مێش لە خۆی دەرکا دەستی لە بەر لووتی ڕاتەکاند. دەستی ڕادەتەکاند و شتێکی دەگوت، ڤاسیلی ئاندریئیڤیچ پێیوابوو بانگی ئەو دەکا. ڤاسیلی ئاندریئیڤیچ کە خەریک بوو بەرەی سەرپشتی ئەسپەکەی ڕێکوپێک دەکرد، نیوەتەواو بەجێیهێشت و چوو بۆ لای نیکیتا و گوتی: «چیت دەوێ؟ دەڵێی چی؟»

نیکیتا بە حاڵەحاڵ و بە شێوەی پچڕپچڕ گوتی: «من... خەریکە... دەمرم.. گوێ بگرە.. هەقدەستەکەم... هەرچەندێکە... بیدە... بە کوڕەکەم.. یان بە ژنەکەم... جیاوازیی نییە.»

ڤاسیلی ئاندریئیڤیچ گوتی: «بۆچی؟.. یانی بەڕاستی پێتوایە خەریکی ڕەق هەڵدێی؟»

نیکیتا بە دەنگێکی لەرزۆک و بە دڵپڕییەوە کە هەروا دەستی ڕادەتەکاند و دەتگوت مێش لە خۆی دەردەکا، گوتی: «هەر بەڕاست... خەریکم دەمرم... گەردنم ئازاکە... بیکە بۆ خاتری حەزرەتی مەسیح....»

ڤاسیلی ئاندریئیڤیچ نیو خولەکێک بێدەنگ لە پەنای ڕاوەستا. پاشان لە ناکاو هەر بەو هەڵسوکەوتە لێبڕاوانەیەوە کە قازانجێکی باشی دەکرد،

دەستی بە یەکدا دا، قۆڵی باڵتە کەڵپۆسەکەی هەڵکرد و دەستی کرد بە لادان و تەکاندنی بەفری سەر نیکیتا و کاشەکە. کاتێک بەفرەکەی بە جوانی لادا، کەمەربەندی باڵتەکەی کردەوە و قۆپچەکانی هەڵگرت و نیکیتای لە سەر تەرکی کاشەکە ڕاکێشا و خۆی بە سەریدا خەوت، ئەو بەو کارە نەک بە باڵتەکەی بەڵکوو بە لەشی گەرمی خۆی نیکیتای داپۆشی. ئاتەگی باڵتەکەی لە بەینی دیوارەی کاشەکە و جەستەی سڕی نیکیتا ئاخنی و چۆکی نایە سەر پەراوێزی باڵتەکە بۆ ئەوەی با هەڵینەداتەوە و سەرما لە کەلێنەکانەوە لەشیان نەگەزێ. بەو شێوەیە دەمەوڕوو بە سەر نیکیتادا ڕاکشا، نێوچاوانی لە سەر لێواری پێشەوەی کاشەکە دانا و ئیتر نە پڕمە و سم لە زەوی کوتانی ئەسپەکەی بیست، نە گڤە و هاژەی زریان. تەنیا گوێی بۆ هەناسەی نیکیتا ڕاگرتبوو. نیکیتا سەرەتا ماوەیەکی زۆر جووڵەی نەکرد، پاشان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دەستی کرد بە جووڵەجووڵ.

ڤاسیلی ئاندرێڤیچ گوتی: «ئەمە چییە ئیتر! دەڵێی خەریکم دەمرم، بەڵام هەر جووڵەی دێ! داکەوە و هەدا بدە با تۆزێ گەرم ببیەوە، ئێمە ئێستا ئاوا...»

بەڵام نەیتوانی درێژە بە قسەکانی بدا و خۆشی سەری لەو حاڵەی خۆی سووڕما، چونکە گریان ئەوکی گرتبوو و فرمێسک لە چاوانیدا قەتیس مابوو، چەناگەی دەستی کرد بە لەرزین. ئیتر قسەی نەکرد و تەنیا ئەوەی ئەوکی گرتبوو قووتی دایەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «دیارە زۆر بێهێز بووم! لە ترسانا خەریک بوو شێت دەبووم!» بەڵام ئەو هێزلێبڕانە

نەک بە لایەوە زۆر ناخۆش نەبوو، بەڵکوو بووە هۆی دڵخۆشیی، ئەویش سۆزێکی تایبەت بوو کە ئەو قەت لە دڵی خۆیدا هەستی پێنەکردبوو.

لە بەرخۆیەوە گوتی: «ئێمە واین ئیترا» لە دڵی خۆشیدا دڵۆڤانییەکی بەرزی هەست پێکرد. ماوەیەکی درێژ هەروا بێدەنگ و جووڵە بە سەر نیکیتاوە مایەوە. فرمێسکەکانی بە ملیوانەی باڵتەکەی سڕی و ئاتەگی باڵتەکەی کە با هەڵیدابۆوە بە چۆکی کێشایەوە ژێر خۆی.

زۆری حەز دەکرد سەبارەت بەو هەستەی لە ناخیدا سەری هەڵدابوو لەگەڵ کەسێک قسە بدا.

گوتی: «نیکیتا!»

دەنگێک لە ژێریەوە هات: «چاک گەرم بوومەوە!»

ـ دەزانی براکەم، من زۆری نەمابوو لەنێو بچم، ئەگەر من لەوێ لەو بەفرەدا رەق بوومایە، تۆ ئێستا لە سەرمانا مردبووی!»

بەڵام دیسان شەویلکەی دەستی کردەوە بە لەرزین و فرمێسک لە چاوانیدا قەتیس ما و ئەمجارەشیان نەیتوانیی قسەکەی تەواو بکا.

«باشە، قەیناکا.» من خۆم ئەوەی پێویستە سەبارەت بە خۆم دەیزانم!»

دیسان بە بێدەنگی جووڵەی لە خۆی بڕییەوە و هەر لەو بارە مایەوە.

لەشی نیکیتا لە ژێرەوە ئەوی گەرم داهێنابوو و باڵتە کەڵپۆسەکەشی لەسەرەوە. تەنیا دەستەکانی کە پەراوێزی باڵتەکەی پێگرتبوو و بە لاقەبرغەی نیکیتاوە گرتبووی و هەردوو لاقیشی کە با بەردەوام ئاتەگی باڵتەکەی هەڵدەدایەوە و سەرما دەیگەزین، کەسیرە بووبوون و خەریک بوو لە سەرمان هەڵوەرێن. بەتایبەت دەستی ڕاستەی کە دەستکێشی تێدا

نەبوو ئیتر گوێی نەدەکرد و تەنانەت نەیدەتوانی قامکەکانی بجووڵێنێ. بەڵام ئەو نە بیری لە لاقی دەکردەوە نە دەستی، تەنیا لە بیری ئەوەدا بوو کە چۆن ئەو مرۆڤە هەژارە گەرم بکاتەوە کە لە ژێریدا بوو.

چەند جار چاوی لە ئەسپەکە کرد و دیتی پشتی ڕووتە و قایشی هەوسار و بەرەکە لە سەر بەفرەکە کەوتوون و دەبوو هەستێ و بیداتەوە بە سەر پشتی ئەسپەکەدا. بەڵام نەیدەتوانی خۆی مرزەم بکات کە بۆ ساتێک نیکیتا بەجێ‌بێڵێ و ئەو هەستەی لە ناخیدا بوو لە ناوی بەرێ. ئەو هەستە خۆش و مرۆڤ‌دۆستانەیە وای لێ‌کردبوو کە ئیتر ترسەکە لە ناخیدا ئاسەواری نەمابوو.

بە خۆی گوت: «ئیتر مەترسییەک لەگۆڕێدا نییە. لە سەرمانا ڕەق نابێ.» ئەو مەبەستی نیکیتا بوو کە لە ژێریدا گەرم بووبۆوە و ئەم قسەیەشی لێوڕێژ لەو هەستی غووروورە بوو کە کاتی شات‌وشووت و تاریف کردنی کارزانی و مامەڵەکانی، خۆی پێوە ڕادەنا.

ڤاسیلی ئاندرێ‌ڤیچ ماوەی سێ سەعات بەو شێوەیە مایەوە، بەڵام ئاگای لە تێپەڕینی زەمان نەبوو. سەرەتا دیمەنی زریان و بادەوە و ئەسپەکە لە نێوان دوو ماڵەبەن و لە ژێر خامووتی کەوانەکەدا، بە شێوەیەکی لەرزۆک بە بەرچاوی خەیاڵیدا تێدەپەڕین و ئەو بیری لە نیکیتا دەکردەوە، کە لە ژێریدا ڕاکشابوو. پاشان میوانیی ڕۆژی ڕابردوو و ژنەکەی و سەرۆک‌پۆلیسی ناوچەکە و قوتووی مۆمەکە بە زەینیدا تێپەڕین، پاشان نیکیتای دی کە لە ژێر ئەو قوتووی مۆمەدا خەوتووە و گوندنشینەکان هاتنە بەرچاوی کە کاڵا و دانەوێڵەکانی خۆیان دەفرۆشت و کەلوپەلی پێویستیان لە ئەو دەکڕی و دوای ئەویش دیواری سپی ماڵەکەی

به سەربانی شیروانییەوە کە نیکیتا لە ژێریدا بوو، هەموو پێکەوە ئاوێتە دەبوون و بە ناخی یەکتریدا ڕۆدەچوون و وەک ڕەنگەکانی پەلکەزێرینە کە دوای تێکەڵ بوون پێکەوە سپی دەبن، ئاوا ئەم وێنە و دیمەنە جۆراوجۆرانەش ئاوێتەی یەکتر بوون و بوون بە هیچ و خەوی لێکەوت. خەوەکەی ماوەیەکی درێژی خایاند و خاڵی و خوڵی بوو. بەڵام نزیک بەیانی خەوەکەی بە خەون ڕازایەوە. لە خەونیدا دیتی لە نێو قوتووی مۆمەکاندا ڕاوەستاوە و ژنەکەی تیخۆنۆڤی[16] دی کە دەیهەوێ مۆمێکی پێنج کۆپکی بۆ جێژن بکڕێ. ئەویش دەیهەوێ مۆمەکە هەڵگرێ و بیداتە دەستی، بەڵام دەستەکانی نەدەجووڵان و لە گیرفانیدا توند قووچاندبوون و نەیدەتوانی نە مشتی بکاتەوە و نە لە گیرفانی دەریان‌هێنێ. دیتی دەیهەوێ بە پەنای قوتووەکەدا تێپەڕێ، بەڵام لاقی هەڵنەدەهاتەوە و نەیدەتوانی بڕوا. پێڵاوە نوێیەکانی کە بریقەیان دەهات، دەتگوت بە تەرکی سەنگفەڕشی دووکانەکەیدا ڕۆچوون و نەیدەتوانی لە عەرزەکەیان بکاتەوە و تەنانەت نەیدەتوانی لاقیشی لە کەوشەکان دەرکێشێ، لە ناکاو قوتووی مۆمەکە ئیتر قوتووی مۆم نەبوو، بەڵکوو پێخەفەکەی خۆی بوو، ئەو خۆی دەدی کە بە سەر قوتووی مۆمەکەدا لە سەر زگ ڕاکشاوە. بە جۆرێک کە لە سەر جێگاوبانەکەی خۆی و لە ماڵەکەی خۆی خەوتووە و ناتوانێ هەستێ، بەڵام دەبوو هەستێ چونکە ئیڤان ماتڤێ‌ئیچ[17]، هەر ئەو سەرۆک‌پۆلیسەی ناوچە، دەهات و بڕیار بوو پێکەوە بچن بۆ مامەڵە کردنی لێرەوار یان بۆ ڕێکوپێک کردنی قایشی هەوسار لە سەر پشتی

16 Tikhonov
17 Matveich

ئەسپەکە، ئەو لە ژنەکەی دەپرسی: «دەی، نیکۆلایۆڤنا نەهات؟» ژنەکەشی وەڵامی دەدایەوە: «نا، نەهات!» هەروەها خشە و سیرەی نزیک بوونەکەی کاشەیەکی دەبیست کە دەهات بۆ بەر ماڵەکەی و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «حەتمەن خویەتی!» بەڵام ئەو نەبوو و کاشەکە تێپەڕی. «ئەی نیکۆلایۆڤنا بوو بە چی؟ نەهات؟» «نا، نەهات!» ئەویش هەروا لە سەر جێوبانەکەی تخێل بووبوو و نەیدەتوانی هەستێ، بەردەوام چاوەڕوان بوو و ئەم چاوەڕوانییەش لەگەڵ ئەوەی زۆر ترسناک بوو، دڵخۆشیشی دەکرد. لە ناکاو دڵخۆشییەکەی کامڵ بوو، چونکە ئەو کەسەی چاوەڕوانی بوو هات. بەڵام ئیڤان ماتڤێئیچ نەبوو، بەڵکوو کەسێکی دیکە بوو. ڕاست ئەو کەسەی ئەو چاوەڕوانی بوو. هات و بانگی کرد، ئەوەی بانگیشی کرد ئەو بوو، ئەرێ ڕاست خۆی بوو، ئەو فەرمانی پێدابوو بە سەر نیکیتادا ڕاکشێ. ڤاسیلی ئاندرێڤیچ دڵخۆش بوو کە ئەو کەسە هاتووە بۆ لای.

دڵخۆشانە دەنگی هەڵبڕی: «ئێستا دێم!» هەر ئەو دەنگهەڵێنانەش لە خەوی ڕاپەڕاند. ڕاپەڕی بەڵام کاتێک ڕوانیی، ئەوە نەبوو کە خەوتبوو، ئەوە نەبوو کە خۆی بە سەر نیکیتادا کێشابوو. ویستی هەستێ، بەڵام نەیتوانی. ویستی دەستی بجووڵێنێ، بەڵام ئەوەشی نەتوانی... لاقیشی... نەیتوانی. ویستی سەری بجووڵێنێ، بەڵام ئەوەشی بۆ نەکرا. سەری لەو حاڵەی خۆی سوورمابوو، بەڵام سەرسوورمانەکەی لەگەڵ خەم و تاڵی ئاوێتە بوو. وەبیری هاتەوە کە نیکیتا لە ژێریدا خەوتووە و گەرم بۆتەوە و زیندووە و وای بە بیردا هات کە خۆی نیکیتایە و نیکیتاش ئەوە و ژیانی ئەو نەک لە خۆیدا بەڵکوو لە نیکیتادایە. گوێی شل کرد و دەنگی هەناسەکێشان و تەنانەت پرخەپرخی نەرمی نیکیتای بیست و بە لەبزێکی

پڕ لـه غـوروور و خاکـەڕاییـەوە گـوتی: «نیکیتـا زیندووە. کـەوایـە منیش زیندووم!»

پارە و سامانەکەی خۆی وەبیر هاتـەوە و هـەروەها دووکـان و مـاڵ و مامەڵەکانی و سامانی چەند ملوێنی میروونۆڤ و سەری لێی دەرنەدەچوو کـە بـۆچی ئـەم کـەسـەی کـە نـاوی ڤاسـیلی ئانـدریێڤیچ بێرخوونـۆڤی بەناوبانگە دەربەستی ئەم شتانەیە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئاخەر ئەو ئاگای لـە بابەتـی سـەرەکی نـەبوو. ئـەو ئـەو جۆرەی کـە مـن ئێستا دەزانـم لـە ڕاستییەکان ئاگادار نەبوو. من ئێستا دەزانم و هیچ هەڵەیەکیش لـە ئێستادا نـاگونجێ. ئێستا دەزانـم!» دیسان دەنگی ئەو کەسـەی بیست کە پێشتر بانگی کردبوو، شاد و دڵخۆشانە و لە ناخی گیانییەوە و بەوپەڕی حـەز و تاسەوە وەڵامی دایەوە: «دێم، ئێستا دێم.» هەستیشی کرد کە ڕزگار بووە و ئیتر هیچ کۆسپ و بەربەستێک ڕێگای لێ ناگرێ و نایگێڕێتەوە.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچ لەم دنیایەدا ئیتر هیچـی نـەدی و هیچـی نـەبیـست و هەستی بە هیچ نەکرد.

دەورووبەریان هەمووی بەفر و تەم و شـەختـە بوو. لـەو تۆفـوبـەنـد و بادەوەیەدا گێژەبا هاژەی دەهات و باڵتەی تەرمەکەی ڤاسیلی ئاندریێڤیچی هەڵدەدایەوە و نوایەک بەفری لێ نیشتبوو. پەیکەری ئەسپەکـە دەلـەرزی و کاشـەکـەش ئیتر بـە حـاڵ بـە دەردەوە بـوو، تـەنیـا دوو قۆڵی ماڵبـەنـەکـە و شاڵەکەی تێی بەسترابوو، بە دەرەوە مابوون، جـەسـتەی نیکیتـاش لـە ژێر تەرمی ئاغا مردووەکەیدا بوو و ئیتر بەفر و باڕن دایپۆشیبوو.

(١٠)

نیکیتا بەری بەیانی خەبەری بۆوە. سەرما، کە دیسان وەک ڕم و خەنجەر لە مۆغەرەی پشتی هەڵدەچەقی خەبەری کردەوە. لە خەونیدا دیبووی لە ئاشی دێتەوە و عارەبانەی پڕ لە ئاردی ئاغاکەی دێنێتەوە. کاتێک لە چۆمەکە پەڕیبۆوە، تایەی عارەبانەکە خلیسکابوو و لە نێو ئاوەکەدا گیری خواردبوو. لە خەونیدا دیتی کە چۆتە ژێر عارەبانەکە و شانی داوەتە بەری و بەرزی کردۆتەوە، بەڵام سەیرەکەی لەوەدا بوو کە عارەبانەکە لە جێی خۆی جووڵەی نەدەکرد و بە شانیەوە نووسابوو. ئەو نە دەیتوانی بەرزی بکاتەوە و نە لە ژێری دەهاتە دەرێ، باری قورسی عارەبانەکە لەوانە بوو پشتی بشکێنێ. بەڵام هەواکەی زۆر سارد بوو و ئەو دەبوو هەرچۆنێکە خۆی لەو بارودۆخە نالەبارە دەرباز بکا. بەو کەسەی کە عارەبانەکە بە پشتییەوە دەگوشی و نەیدەزانی کێیە، گوتی: «بەسە ئیترا گۆنییە ئاردەکان هەڵگرە و فڕێیان دە دەرێ!» بەڵام باری سەرمای عارەبانەکەی بەردەوام ساردتر دەبوو و بڕبڕەی پشتی ڕێکدەگوشی. لە ناکاو بە چەند زرمە و پرمەی سەیر لە خەو ڕاچەنی و هەموو شتێکی بە باشی وەبیر هاتەوە. ئەم بارە ساردە تەرمی ئاغاکەی بوو کە ڕەق هەڵاتبوو و هەروا لە سەر جەستەی قورسایی دەکرد و تەقوکوت و زرمەکەش ئەسپەکە بوو کە سمی لە کاشەکە کوتابوو.

نیکیتا کە خەریک بوو هەستی بە ڕاستی دەکرد، بە پارێزەوە بانگی کرد: «ڤاسیلی ئاندریێڤیچ، ڤاسیلی ئاندریێڤیچ!» هەوڵیدا پشتی هەڵێنێ بەڵام نەیتوانی.

ڤاسیلی ئاندریێڤیچیش وەڵامی نەدایەوە و زگ و لاقی وەک کێشێکی سارد و قورس لە سەر پشتی بوو و جووڵەی لێ بڕیبوو.

نیکیتا لە دڵی خۆیدا گوتی: «حەتمەن مردووە! خودا لێی خۆشبێ!»

سەری وەرسووڕاند و بە دەستی، بەفری بەردەمی لادا و چاوی هەڵێنا. هەوا ڕووناک بووبۆوە. بەڵام گژەبا هەروا بە نێوانماڵبەن و قۆڵەکاندا گڤەی دەهات و کڕێوەی دەکرد وەکوو بێژنگ گێژی دەدا و دەنیشتە سەر پشتی ئەسپەکە و کاشەکە و بەردەوام بارستاییەکەی زیاتر دەبوو، ئیتر نە ترپەی سمی ئەسپەکە و نە پڕمەی لووتی نەدەبیست. نیکیتا لە دڵی خۆیدا گوتی: «حەتمەن ئەویش ڕەق هەڵاتووە!» هەر بە ڕاستیش وا بوو و ئەو تەقوکوتەی لە کاشەکە هەستابوو زرمەی سمی ئەسپەکە بوو کە ئەوی لە خەو ڕاپەڕاندبوو و دوایین هەوڵی ئەسپە ڕەقهەڵاتووەکە بوو بۆ ئەوەی خۆی بە پێوە بگرێ.

نیکیتا بە خۆی گوت: «خودایە گیان، دیارە بانگی منیش دەکەی بێم بۆ لات! هەرچی تۆ بیفەرمووی وایە و پیرۆزە! بەڵام من دەترسم! مەرگ تەنیا جارێکە، گریمان ئەو یەکجارەش ئێستا تەپی داوەتە سەرم، بەڵام داوات لێدەکەم زووتر گیانم بکێشە و ڕزگارم کە!» دیسان دەستی بردەوە ژێر تەرمەکە و چاوی قووچاند و خۆی لەبیر چۆوە، چونکە بە تەواوی دڵنیا بوو کە ئێستا دەمرێ و ڕەقهەڵاتنی یەکجارییە.

ڕۆژی دوایی، کاتی فراوێن کە گوندنشینەکان ڕچەیان شکاند و خۆیان گەیاندە لای کاشەکە، ڤاسیلی ئاندریڤیچ و نیکیتایان لە شەست حەفتا مەتریی جادەکە و نیو وێرست دوور لە گوندەکەیان لە ژێر بەفر دەرهێنایەوە. بەفر کاشەکەی بە تەواوی داپۆشیبوو و تەنیا نووکی ماڵبەنەکان و شاڵەکە بە دەرەوە بوو کە با دەیشەکاندەوە. بارستایی بەفرەکە هەتا بەرزگی ئەسپەکە هاتبوو و بەرەکەی سەر پشتی کەوتبووە خوارێ. قایشی هەوسارەکە بە لای سەریدا شۆڕ بووبۆوە و سەرتاپای سپی بوو و سەرە ڕەقهەڵاتووەکەی بە بەرملیەوە نووسابوو و دەتگوت ئەسپە بەفرینەیە بە پێوە چەقیوە. هەردوو کونە لووتی چلوورەی پێوە شۆڕ بووبۆوە و چاوانی کەڕەسیسەی لێ نیشتبوو و دەتگوت فرمێسکەکانیەتی بەستوویە! بەو تەنیا یەک شەوە بە جارێ لاواز بووبوو، هەر پێست و یەسقانەکەی مابوو. ڤاسیلی ئاندریڤیچ تەرمێکی ڕەقهەڵاتوو بوو و کاتێک لە سەر نیکیتایان لابرد و لەولاوە دایاننا دەست ولاقی هەروا ڕەق و لێکبڵاو مانەوە. چاوی زەق و بایەقووشئاسای بووبوونە دوو پارچە سەهۆڵ و دەمی داچەقاوی لە ژێر سمێڵەکانیدا پڕ بووبوو لە بەفر. بەڵام نیکیتا زیندوو بوو، ئەگەرچی زۆر بە سەختی سەرما گەستبووی. کاتێک وەهۆشیان هێنایەوە، دڵنیا بوو مردووە و ئەوەی دەیبیستێ لەم دنیایە نییە بەڵکوو لەو دنیایە. بەڵام کە دەنگی قرموقاڵی گوندنشینەکانی بیست کە تەرمی ڕەقهەڵاتووی ڤاسیلی ئاندریڤیچیان لە سەر پشتی لادەبرد سەرەتا تووشی سەرسووڕمان بوو کە لەو دنیاش گوندنشینەکان وەک ئەم دنیایە بەجێی

ئەوەی شاد و دڵخۆش بن، مات و خەمبارن. بەتایبەت کاتێک دیتی قامکی هەردوو لاقی سەرما بردوویەتی.

نیکیتا دوو مانگ لە نەخۆشخانە مایەوە و سێ قامکی لاقیان بڕیەوە و زامی قامکەکانی دیکەیان بۆ سارێژ کرد. بە جۆرێک کە دەیتوانی کار بکات و بیست ساڵی تر ژیا. سەرەتا وەک ڕابردوو کرێکاری کشتوکاڵ بوو، بەڵام بە پیری ئیشی کێشکچێتی دەکرد. ئەو ئەمساڵ مرد، لە ماڵەکەی خۆی و بە پێی ویستی خۆی لە ژێر وێنەی پیرۆز و مۆمێک بە دەستەوە، بەر لەوەی بمرێ داوای گەردنئازایی لە ژنەکەی کرد و ئەوی بە هۆی کەینوبەینی لەگەڵ کابرای بەرمیلبەند بەخشی و گەردنی ئازا کرد. ماڵئاوایی و گەردنئازایی لەگەڵ کوڕ و بووکەکەشی کرد و دوای ئەوەی نەوەکانی لە ئامێز گرت و دەستی بە سەریاندا هێناو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و مرد. ئەو لە ڕاستیدا دڵخۆش بوو کە کوڕ و بووکەکەی لە دەست ملۆزم و نانخۆر و جێگرێک ڕزگاریان بووە و خۆشی لە ڕاستیدا لە چنگ ئەو ژیانە پڕ ئازار و چەرمەسەرییە نەجاتی بوو کە ڕۆحی هێنابووە سەر کونەلووتی و قەت لە ژیانیدا نەحەسایەوە. ئەو دەیزانی دەڕوات و ژیانێکی تر دەست پێدەکات کە هەموو ساڵ و ڕۆژ و سەعاتێکی شیرینتر و خۆشترە و بەدوورە لە ئازار و چەرمەسەرێ و چەوسانەوە. ئەوەی کە ئەو کاتێک لەو دنیا لە مەرگی ڕاستەقینە ڕاپەڕی لەم دنیا خۆشتر بوو یان ناخۆشتر و ئەوەی کە لەو دنیا هەر ئەوەی دیتەوە کە چاوەڕوانی بوو یان نا، شتێکە کە ئێمەش هەموومان بە زووترین کات دەیبینین و تێیدەگەین.

## فەرهەنگۆک

**ئاغزوونە:** ئاڵقەی ددانە داری کانزا کە زمانەی تێدایە بۆ داخستنی قایشی پشت و کەوش و... بەکار دەهێنرێ.

**باڕووشک:** بارینی بەفر و باران بە باوە؛ باپووسکە.

**باسریشک:** بەفر و باران و با پێکەوە.

**باوەپیارە:** زڕباوک، مێردی دایک.

**بایەقووش:** کوندەبوو.

**بڵقەتاف:** شەوەزەنگ، شەوی تاریک و ئەنگوستەچاو.

**بەرمیلبەند:** دروستکەری بەرمیلی دارین کە ئەو سەردەمە بە جێی گاڵۆن بەرمیلیان لە دار دروست دەکرد.

**بەرمیلئاژۆ:** کەسێک کە بە بەرمیلی گەورە لە سەر عارەبانە ئاو و سووتەمەنی بۆ خەڵک دەبرد.

**بەفر بەسەر:** شوێنێ کە بەفرەکەی توند دەبێت و وای دەبەستێ ئیتر لاقی تێهەڵناچەقێ.

**بەفرکوش:** زەوییەک کە بەفرەکەی درەنگ دەچێتەوە و زۆر توند و ڕەق دەبێت و گیای لێ شین نابێ.

**بەلەکپێچ:** پووزەوانە، پزلووخ، پووزلەخ.

**پندر:** کزر، نیوەوشک.

**پەرجۆ:** مۆجزە (معجزە)

**پەیزەن:** کەسێک کە لە کاتی ڕۆیشتندا لاقی لە یەک دەدرێن.

**چارەوێ:** ئەسپ، یەکسم، ماین.

**چلمێردە:** پشتبەستی دەرگا؛ دارێکە دەیخەنە پشت دەرگا بۆ قایم کردنی.

**خامووت**: کەوانەی عارەبانەکە لە ملی چارەوێ دەکرێ بۆ ڕاکێشانی کاشە و عارەبانە.

**خووسار**: زوقم، سیخوار

**خۆڵەپێوک**: گلەمردە، بێستان و مەزرایەک کە گیای هەرزی تێدا نەمابێ و بە تەواوی بژار کرابێ.

**خۆماک**: غەریزە.

**خەرەند**: خەندەک، قووڵکی درێژی لە زەوی هەڵکەندراو یان ئاودڕ.

**ڕەوگە**: ڕێباز، شوێنی هاتوچۆ.

**سمێڵچەورانە**: دەمشیرینی، بەرتیل.

**قۆڵ**: داری درێژی ئەملا و ئەولای کاشە و عارەبانە کە ئەسپەکە دەکەوێتە نێوانییەوە. ماڵبەن (مالبند)

**کاشە**: سوورتمە. ئەو شتەی بێ پێچکە و تایەیە و بە سەر بەفردا ڕایدەکێشن.

**کوڵەباڵ**: پەستەک، هێلەگ

**کێلەدار**: داری چەقێندراو لە قەراغ ڕێگا بۆ نیشاندانی ڕەوگەی ڕێگاکە؛ کێلەڕێ.

**کەرپووچ**: خشتی سوور؛ ئاجوور

**کەڵپۆس**: باڵتە و جلوبەرگی لە پێستی ئاژەڵ دروست کراو.

**کەوی**: ڕام، دەستەمۆ، دژی تۆڕ و سلۆک.

**گوڵهەنگ**: گوڵەڕۆنینە. گوڵەبەڕۆنە. گوڵێکی زەردە بە مەشکەوە هەڵیدەواسن بۆ زۆر بوونی ڕۆن.

**گوڵەبەڕۆنە**: گوڵهەنگ، گوڵەڕۆنینە.

**مرووشکێن**: ئیشتیا لابەر، ئەوسکوێرکەوەرە.

**نگوونگ**: کوێرەکەی بەرکەڵ، دامنەچەقان، نوینک، نوێگوان.

**هانکەهانک:** وەهەناسەبڕکێ کەوتن لەبەر ماندوویی و شەکەتیی زۆر.

**هۆمەن:** هێرش، شالاو، هەڵمەت.

**هەنتەش:** حوزوور، لەبەردەم.

**یەکهاوی:** مانەوە لەسەر بارێک و ڕۆیشتن و ژیانی بەبێ گۆڕان. (یکنواخت)

## بەرهەمی بلاوکراوەی وەرگێڕ:

١. تاپۆی وەرزێکی سەوز، شیعر، ١٩٩٧

٢. شەوەژانی ئەستێرەیەک، شیعر، ٢٠٠٠

٣. مەرگەخەون، شیعر، ٢٠٠٣

٤ـ دیسان لەو شەقامانەوە، کۆچیرۆکی بیژەن نەجدی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٥

٥. تەپڵی ئاور، کۆچیرۆکی بیانی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٥

٦. جێگەی بەتاڵی سلووچ، ڕۆمان، مەحموود دەوڵەتئابادی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٦

٧. خۆر و لاولاو، کۆشیعری منداڵان، ٢٠٠٧

٨ـ برایانی کارامازۆف، ڕۆمانی داستایۆفسکی، وەرگێڕان ٢٠٠٧

٩. یەککگرتن، چیرۆکی منداڵان، قودسی قازی نوور، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٧

١٠. خولیای نووسین، ڕەزا بەراهەنی، کۆمەڵەوتار، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٨

١١. فەرهەنگی ڕێژگە (ئەو وشانەی لە هەمبانەبۆرینەدا نین)، ٢٠٠٩

١٢. کەڵەشێری ورگن، گێڕانەوەی چیرۆکێکی فۆلکلۆر، ٢٠١٠

١٣ــ تازیــەبــارانی بــەیــەل، ڕۆمــان، غــولامحوســێن ســاعیدی، وەرگێڕدراو، ٢٠١٠

١٤. ئاناکارنینا، ڕۆمان، لیۆن تۆلستۆی، وەرگێڕدراو، ٢٠١٠

**ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:**

١. نارنجیفڕین، کۆچیرۆک

٢. دار و پەپوولە و ڕووبار، چیرۆکی منداڵان، فەریدە شەبانفەر، وەرگێردراو

٣. سترانی شەپۆلەکان، شیعری هاوچەرخی فارسی، وەرگێڕدراو

4- ڕێگایەک بەرەو هەتاو، کۆچیرۆک، وەرگێڕدراو

٥. ئەرباب و نۆکەر، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

٦. باوە سیرگی، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

. دیلی قەفقاز، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

. مەرگی ئیڤان ئیلیچ، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

. ئاپۆرەی خەو، کۆمەڵە شیعر

. زایەڵەی شاخ و قیژەی گوڵەباخ، کۆمەڵە شێعر

. هاوار و ژیلەمۆ، کۆمەڵە شێعر

**سەرچاوە:** ارباب و بنده، لیو تولستوی، ترجمەی شروش حبیبی، چاپ اول، پاییز تهران نشر چشمه

کۆنت لیۆنیکۆلاڤیچ تۆلستۆی (١٨٢٨-١٩١٠) یەکێک لە نووسەرە گەورەکانی دنیایە و هەروەها یەکێک لە بلیمەتەکانی جیهانی ئەدەب دێتە ئەژمار. تۆلستۆی لە ماوەی ٨٢ ساڵ تەمەنی خۆیدا شایە-دی پڕگۆڕانکاریترین سەدەکان و دەورە-کانی مێژووی وڵاتی خۆی بوو، ئەو جگە لەوەی نووسەرێکی مەزن بوو، فەیلە-سووف و ڕێبەرێکی کۆمەڵایەتیش بوو کە هاوچەرخەکانی لە هەمبەریدا سەری ڕێزیان دادەنەواند.

ئەو چوار نۆڤلێتە (باوکە سێرگی، دیلی قەفقاز، ئاغا و نۆکەر و مەرگی ئیڤان) بەبۆنەی سەدەمین ساڵوەگەڕی مەرگی لیۆن تۆلستۆی ئەو نووسەرە مەزنە، وەرگێرمەوە و پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی بکەم.

بەو هیوایەی توانیبێتم وەرگێڕانێکی باش و جێگای متمانە بخەمە بەردەستی خوێنەران و لایەنگرانی قەڵەمی تۆلستۆی.

وەرگێر



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
٢٠١١

چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر